




- **هێگڵ و دوو لە قوتابییانی**
- نووسەر: عوسمان یاسین
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ٩٦٥
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٧٧)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com




## پێڕست







# پێشەکی

گومان لەوەدا نییە کە هێگڵ لە مێژووی نوێی فەلسەفەدا رۆڵێکی کاریگەریی هەیە، لەبەر ئەوەی فەلسەفە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە لەسەر دەستی هێگڵدا چووە قۆناغێکی دیکەوە، دوای ئەوەی کە ئەم فەیلەسوفە توانی وەرچەرخانێکی گەورە لەبیرکرنەوە فەلسەفییەکاندا بەدی بهێنێت، ئەمەش لەمیانەی خستنەرووی تیورە بەنێوبانگەکەی لەبارەی لۆجیك و دیالکتیك، کە بووە هۆی ئەوەی شۆرشێکی مەزن لە بواری فەلسەفەدا بەرپا بکات.

جا لەبەر ئەوە فەلسەفەی هێگڵ شوێنێکی بەرچاوی هەیە لە مێژووی نوێی فەلسەفەدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی، کە چەندان بیرمەندی دیکە بکەونە ژێر کاریگەری ئەم فەلسەفەیەوە. ئەم کاریگەرییەی فەلسەفەی هێگڵ شێوازی جۆراو جۆری بە خۆوە وەرگرتووە.

مارکیۆز و لۆکاش  کە دووبیرمەندی سەدەی بیستەمن، بە شێوەیەکی ئاشکراو روون کاریگەریی فەلسەفی هێگڵ بەسەر فەلسەفەو بیرکردنەوەکانیاندا دیارە.

لە دوو توێی ئەم پەرتوکەدا کە لە سێ بەش پێکهاتووە ، هەر بەشێك بۆ هەر یەك لە بیرمەندان هێگڵ و مارکیۆز و لۆکاش تەرخانکراوە، کە تێیدا بە شێوەیەکی چڕو پڕ باسی هێلە سەرەکییەکانی بیرکردنەوەی ئەم سێ بیرمەندە کراوە،کە فەلسەفەی هێگڵ وەکو پێشەنگی فەلسەفەو بیرکردنەوەی هەردوو بیرمەند (مارکیۆز و لۆکاش) باسی لێوە کراوە، دواتریش داهێنانەکانی ئەم دوو بیرمەندە وەکو دوو قوتابی فەلسەفەی هێگڵ خراونەتە روو.

عوسمان یاسین
هەولێر ۲۰۰۷
osmanyasenali@hotmail.com







# دەستپێك

لەم باسەماندا لەسەر بیرمەندی گەورەی ئەڵمانی هێگڵ، هەوڵدەدەین لە سێ تەوەردا باس لەو بیرمەندە بکەین، لە تەوەری  یەکەمدا باسی ژیان و هزری هێگڵ دەکەین ، لە تەوەری دووەمدا باسی سیستەمە هاوتەباکەی ئەو بیرمەندە دەکەین، لە تەوەری سێیەم وکۆتاییدا باس لە  یاساو دەوڵەت لە فەلسەفەی ئەو بیرمەندە دەکەین.





# تەوەری یەکەم

## ژیان و هزری هێگڵ

جۆرج ویلهێلم فریدریچ هێگڵ (Georg Wilhelm Friedrich Hegel) لە بەرواری ٢٧ ئابی ١٧٧٠ لە شاری شتوتگارت (Stuttgart)ی ئەڵمانیا لە دایکبووە، خێزانی هێگڵ بە ڕەچەڵەك خەڵکی هەرێمی کرنتیا (Karnte) ی سەر بە نەمسا بوون، فردیانییدی دووەم پادشای ئەو هەرێمە کاسۆلیکێکی توندڕەو بوو، لەبەر ئەوە پرۆتستانتەکانی ئەو هەرێمە ناچار بوون لەو شوێنە کۆچ بکەن، ئەوە بوو هانس هێگڵ کە پرۆتستانتی بوو، دوای هەڵاتنی لەو هەرێمە لە هەرێمی ئشڤابن (Schwaben ) ی باشووری ئەڵمانیا جێگیر بوو، بنەماڵەی هێگڵ کە ڕەچەلەکیان بۆ هانسی باپیرە گەورەیان دەگەرێتەوە، دواتر لە هەرێمی ڤورتمبورگ (Wartemberg)نیشتەجێبون، باوکی هێگڵ کە ناوی جۆرج لودڤیچ هێگڵ (Georg Ldwig Hegel) بوو لە ساڵی ١٧٣٣ لە دایك بووە، کە لە لای کارل ئویجن(Karl  Eugen )ی دۆقی ئەو هەرێمە فەرمانبەرێکی پلە بەرزبوو، ماوەیەك سکرتێری ژووری دارایی بوو، پاشان بووە راوێژکاری نووسینگەی دۆق، لە ساڵی ١٧٦٤ ماریا مجدلینای خواست و هێگڵ یەکەم منداڵیان بوو، پاشان کچێکیان بوو بە ناوی (کرستیانا-Chrisiana) و دواتریش کوڕێکی دیکەیان بوو بە ناوی (لۆدفیچ-Lodwig)، [1].

دەربارەی ژیانی سەرەتای هێگڵ لە زێدی لە دایکبوونی (شتوتگارت) زانیارییەکی تەواو لە بەردەستدا نییە، جگە لەو زانیاریيانە نەبێت کە (کرستیانا)ی خوشکی هێگڵ لە نامەیەکدا پێش خۆکوشتنی باسی لێوە کردەوە، یاخود ئەو زانیاریيانەی، کە هێگڵ لە بیرەوەرییەکانیدا لەو کاتەی تەمەنی چواردە ساڵی بووە

دەستی بە نووسینەوەیان کردبوو، کە باسی ژیانی سەرەتایی خۆی لـە (شـتوتگارت) کردووە.

لـە ١٨٣٢\١\٧ کرسـتیانا لـە نامەیەکیـدا هەنـدێك لـە لایەنـەکانی ژیـانی سەرەتایی هێگڵی باس کردووە، لەو نامەیەیدا دەنووسێت: کاتێك ئەو —هێگڵ- لـە تەمەنی سێ ساڵان بوو، باوکی رەوانەی قوتابخانەیەکی ئەڵمانی کـرد، کـە تەمـەنی بووە پێنج ساڵ رەوانەی قوتابخانەیەکی لاتینی کرد، پێش ئەوەی هێگڵ بـچێتە ئـەو قوتابخانە لاتینییە هەندێك لە لایەنـەکانی رێزمـانی لاتـینی دەزانـی، کـە لەلایـەن دایکی ئازیزمانەوە فێرببوو، دایکمان رۆشنبیرییەکی فراونی هەبوو و کاریگەرییەکی بە هێزی لە قۆناغی سەرەتاییدا کردە سەر هێگڵ، هێگڵ هەموو ساڵێك لە هـەموو قۆناغەکانی خوێندندا خەڵاتی وەردەگرت، لەبەر ئەوەی هەمیشە لە پێـنج قوتابییـە یەکەمەکانی قوتابخانەکەی بوو، هەر لە تەمەنی دە ساڵی تاوەکو هـەژدە سـاڵی لـە قوتابخانەی ئامادەییدا هەمیشە بە یەکەم دەردەچـوو، لـە تەمـەنی هـەژدە سـاڵیدا (لۆڤلـەر-Löffler)ی مامۆسـتای کـە هێگڵـی زۆر خۆشدەویـست و دەورێکـی کاریگەری هـەبوو لـە پەروەردەکردنیـدا، شـانۆگەرییە دراميیـەکانی شکـسپیر(کـە ئیـشنبەرگ-Eschenburg وەریگێڕابـوو) پێـشکەش کـردو پێـی گـوت (ئـەی بچووکم، ئێستا کە لەم شانۆگەرییانە ناگەیت، بەڵام زوو فێری ئەوە دەبیت، کە چۆن تێیان بگەی)، بەم جۆرە ئەم مامۆستایە تێبینی ئـەوەی کردبـوو کـە ئـەو منداڵـە خاوەن بلیمەتییەکە، تاکو ئێستاکەش باشم لـە بـیرە کـە یەکـەمین شـانۆگەری لـەم شـانۆگەرییانە کـە هێگـڵ خوێندییـەوە شـانۆگەری (ژنـە دڵخۆشـکەرەکانی لەوندسور)بوو، هەرچەند باری تەندروستی باش بووایە، زیاتر کتێبی لەسەر درامـای یۆنانی دەخوێندەوە، هێگڵ زۆر حەزی لە خوێندنەوە دەکرد، هەروەك چۆن دەربـارەی زانستی رووەك دەیخوێندەوە، لە ساڵەکانی دوایی قۆناغی قوتابخانـەی ئامـادەیی زۆر گرنگی بە سروشتناسی (علم الطبیعة) دەدا" [٢].



بەم شێوەیەی لەم کاغەزەی خوشکی هێگڵدا —کرستیانا- دەردەکـەوێت هێگـڵ هەر لە قۆناغی منداڵییەوە قوتابییەکی چاپووك و چالاك بـووە و بلیمـەتی و ژیـری پێوە دیاربووە، جگە لـەم نامەیـە، هێگـڵ لـە بیرەوەرییـەکانی خۆیـدا لـە سـاڵانی ١٧٨٥-١٧٨٧باسی خۆی کردووە و هەڵسوکەوتی خۆی لەو رۆژگارەدا تۆمـارکردووە و هـەروەها بەتایبـەتی ئـەو لایەنـەی ژیـانی خـۆی خـستۆتە روو کـە گرنگـی بـە خوێندنەوەی بەرهەمە کلاسیکییەکانی یۆنانی و ئەدەبی لاتینی داوە، کە لە راستیدا ئـەم خوێندنەوانـە دواتـر دەردەکـەوێت چـەند کاریگەربوونـە بەسـەرییەوە، ئـەم کاریگەرییەش بەوە گەیشتبوو کە هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان وای دەبینن کە نارێکی شێوازی نووسینی هێگڵ لە بەکارهێنانی رستەی درێـژو بـەکارهێنانی دەسـتەواژەی نامۆ و نامەئلوف بەهۆی کارتێکردنی زمانی لاتینی بەسەرییەوە بووە.

هێگڵ لە ٥ یولیو ١٧٨٥لە بیرەوەرییەکانیدا باسی ئەوە دەکات کـە لـەم رۆژەدا لە کتێبخانەی مامۆستاکەی لۆڤلەر (دوای مردنی) دوازدە کتێبی دەربارەی ئـەدەبی یۆنانی و لاتینی کڕیوە، لە رۆژانـی دواتـردا بـاس لـەوە دەکـات کـە لەگـەڵ کلـس (Cless) ی مامۆستای گەشتێکیان کـردووە و کەسـایەتی سـوقراتیان شـەن وکـەو کردووە و ئەو سێ کەسەیان ناسیوە کە کاریان کردووە لەبەردەم ئەنجوومەنی پیران تا سوقرات لـە سـێدارە بـدرێت، رۆزنگـرانتس کـە بیرەوەرییـەکانی هێگڵـی لـە ژێـر ناونیشانی (ژیانی هێگڵ) بڵاوکردۆتەوە و دەڵێت: هێگڵ لە تەمەنی شـازدە سـاڵیدا کتێبی لۆنجینوسی (Longinus ) ی بەتەواوی لە یۆنانیـدا وەرگێڕابـوو، کـە تـاکو ساڵی ١٨٤٤ ئەم وەرگێڕانە مابوو. زیاتر هێگڵ مەیلی بۆ لایەنی یۆنانییـەکان بـوو نەك رۆمانییەکان، لەبەر ئەوە سەرقاڵی خۆێندنەوەی ئـەدەبی لاتـینی بـوو، تـاوەکو نەگەڕێتەوە بۆ دواوە. لەم بارەیەوە هێگڵ زۆری خوێندۆتەوە تا ئـەو رادەیـەی فێـری شێوازی لاتینی بەرز بووە، لە نووسیندا رستەی زۆر دەگمەن و دەستەواژەی نائاسایی بەکاردەهێنا [٣].





هێگڵ هەر لە تەمەنی شازدە ساڵیدا داستانی (ئەلیازە) و نووسینەکانی (شیشرون) و (یورپیدس)ی خوێندۆتەوە، لە ٥ی ئەپریلی **١٧٨٦** خەریکی وەرگێڕانی (ئەخلاق)ی ئیکتیتوس بوو، لە بەهاری **١٧٨٨** ئەخلاقی ئەرستۆی خوێندەوە، لە هاوینی هەمان ساڵدا (ئۆدیب لە کولونا) ی (سۆفوکلیس)ی خوێندەوە، بەبێ پچڕان هێگڵ بۆ چەندان ساڵ خەریکی خوێندنەوەی بەرهەمەکانی سوفوکلیس بوو، هەندێك لە شانۆگەرییەکانی بۆ سەر زمانی ئەڵمانی وەرگێڕا، لەوانەش شانۆگەری (ئەنتیگۆنا) کە تاکو ئێستاکەش وەرگێڕانە ئەڵمانییەکەی هێگڵ ماوە، ئەم شانۆگەرییە لای هێگڵ گرنگی تایبەتی خۆی هەبوو، چونکە ئەو وای بۆ دەچوو، ئەم شانۆگەرییە بە شێوەیەکی زۆر قوڵ و ڕێکوپێك وێنەی ئیستاتیکای روحی یۆنانی گرتووە، جا لە بەر ئەوە هێگڵ بە درێژایی ژیانی گرنگی بەلایەنی ئیستاتیکی و ئەخلاقی ئەم شانۆگەرییە دەدا..

خوێندنەوەی هێگڵ بۆ ئەدەبیاتی یۆنانی دەبێتە هۆی ئەوەی شارستانی ئەسینا ببێتە جێگای سەرسورمانی ئەو فەیلەسووفە، کە دواتر کاریگەری گەورەی بەسەرییەوە دەبێت، هەرچەندە هێگڵ لە قۆناغەکانی دواتری ژیانی کەمتر بەرهەمی ئەدەبیاتی یۆنانی دەخوێندەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستبەرداری ئەو بۆچوونە نەدەبوو، کە دەیوت: ڕۆشنبیرێکی ئەڵمانی کاتێك لەماڵەوەی خۆی سەیری شارستانی یۆنانی دەکات و ئەو شارستانییە دەخوێنێتەوە، ئەو راستییەی بۆ دەردەکەوێت کە ئەوروپییەکان ئایینەکەیان لە ڕۆژهەڵاتەوە وەرگرتووە، بەڵام زانست و هونەرەکانیان و هەموو ئەو شتانەی کە ژیانیان بەرز دەکاتەوەو جوانکاری و لەخۆبوردوویيان پێدەبەخشێ، ئەوانەیان هەموو لە یۆنانەوە وەرگرتووە، ئەمەش بە ڕێگای راستەوخۆ بێت یاخود بە ڕێگایەکی ناراستەوخۆ.

**ویل دیورانت** هەر لەبارەی کاریگەری یۆنانییەکان بەسەر هێگڵەوە دەڵێت: کاریگەری شارستانی یۆنانی بەسەر هێگڵەوە بە رادەیەك بوو، کە بۆ ماوەیەك هێگڵ ئایینی یۆنانی لە ئایینی مەسیحی بە پەسندتر دەزانی، لەو کاتەدا بوو کە هێگڵ





کتێبێکی نووسی و تێیدا نکۆڵی لە موعجیزەکانی مەسیح کرد و مەسیحی بە کوڕی (مەریەم یوسف)ی لە قەڵەمدا، بەڵام دواتر هێگڵ هەر خۆی ئەم کتێبەی فەوتاند. [٤]

ولتر ستیس لە کتێبەکەیدا دەربارەی فەلسەفەی هێگڵ ئەو هێڵە سەرەکییەی ئایدیالیزمی یۆنانی دیار دەکات کە کاریگەری لەسەر فەلسەفەی هێگڵ هەبووە، هەروەها دواتریش (د. امام عبدالفتاح امام) پسپۆر لە فەلسەفەی هێگڵ و سەرپەرشتیاری (کتێبخانەی هێگڵ – المكتبة الهيجلية) لە دەزگای بڵاوکردنەوی (التنوير) لە بەیروت، لە تێزەکەیدا (میتۆدی دیالیکتیکی لای هێگڵ) هەمان ڕێچکەی (ولتر ستیس) ی گرتووە و کە باس لە کاریگەری زینونی ئەیلی و هێراقلیتس و جورجیاس و سوقرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ لەسەر فەلسەفەی هێگڵ دەکات. [٥]

لە ساڵی **١٧٨٣**دایکی هێگڵ دەمرێت، ئەو دایکەی کە دەورێکی سەرەکی هەبوو لە پەروەردەکردنی ڕۆشنبیری قۆناغی سەرەتایی لە ژیانی هێگڵدا، هێگڵیش زۆر بە دایکییەوە پەیوەست بوو، بە درێژایی ژیانی دایکی لە یاد نەکردووە، لە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵیدا لە بەرواری **٣٠** سێپتێمبەری **١٨٢٥** لە نامەیەکیدا بۆ (کرستیانا) ی خوشکی دەنووسێت: (ئەمڕۆ یادی کۆچکردنی دایکمانە، هەمیشە ئەوم لە یادە). [٦]

لە ساڵی **١٧٨٨**هێگڵ دەچێتە ئەنستیتۆی توبنگن (Tubingen ) کە ئەنستیتۆیەکی ئایینی بوو، چەندان قەشەی بەناوبانگ تێیدا خوێندبوویان، ئەم ئەنستیتۆیە ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لە خوێندنی ئایینی و ئەکادیمی لە ئەڵمانیادا، کاتێك هێگڵ بە توانایەکی بەرزو بەلێهاتووییەوە پەیوەندی بەم ئەنستیتۆیە دەکات، هەر دوو زمانی یۆنانی و لاتینی باش دەزانێ و شارەزاییەکی باشیشی دەربارەی ئەدەبی ئەڵمانیش هەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە ڕۆشنبیرییەکی فراوانی دەربارەی زانستە سروشتییەکان پەیداکردبوو، لەو کاتەدا هێگڵ بەهۆی پەیوەندی بە ئەدەبیاتی

یۆنانی و شیعر و فەلسەفە، هاوڕێیەتی لەگەڵ (هۆلدرین) و (شلنگ) پتەو دەبێت، هەروەها لەم خوێندگایەدا هێگڵ هاوڕێیەکی دیکەی هەبوو ناوی لوتفین (Leutwin) بوو کە لە ساڵی ١٨٣٩ دوای هەشت ساڵان لە کۆچکردنی هێگڵ هەندێ لە بیرەوەرییەکانی خۆی لەگەڵ هێگڵ لە ڕۆژانی خوێندن لەو ئەنستیتۆیەدا بڵاوکردەوە، لوتفین لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: گاڵتەو گەپ و قسە خۆشەکانی زۆر جاران دەیانکردە هاوڕێیەکی خۆشەویست، بەڵام شتێکی دیکەی هەبوو کە نابێت فەرامۆش بکرێت، ئەویش ئەوەبوو کە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی تارادەیەك لە بوهیمییەکان دەچوو، ئەم ڕەفتار و هەڵسوکەوتەشی زۆرجاران لەگەڵ داب و نەریتی ئەنستیتۆ نەدەگونجا، هەروەها زۆرجاران کاتێك قوتابییەك لە خوێندن پێشی دەکەوت، ئەو بە توندی هەڵدەچوو، جارێکیان زۆر توڕەبوو کە لە هۆبەکەماندا لە کەسی سێیەم پلەی هاتە خوارێ بۆ کەسی چوارەم..

لوتفین لە درێژەی بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: لە ماوەی ئەو چوار ساڵانەی کە(هێگڵ) م ناسیوە، ئەو گرنگی بە میتافیزیقیا نەدەدا، بەڵام نموونەی بەرزی ئەو (ڕۆسۆ) بوو ئەویش بەهۆی کتێبەکانییەوە(ئەمیل) و (پەیمانی کۆمەڵایەتی) و (دانپێنانەکان) کە هێگڵ لە خوێندنەوەیاندا هەرگیز هەستی بە بێزاری نەدەکرد، ئەو وای بۆ دەچوو کە خوێندنەوەی بەردەوام لە حوکمدانی سادە و سەرەڕۆیانە دووری دەخاتەوە، یاخود بەقسەی خۆی کە دەیگوت: لە کۆت و بەندەکان ڕزگارمان دەکات، بەڵام ئەو بیر و بۆچوونانەی هێگڵ کە دواتر دەرکەوتن، لە دوای دەرچوونی لە ئەنستیتۆ دەستگیری کردبوون، لەبەر ئەوەی ئەو کات زۆر بەجدی لەگەڵ فەلسەفەی کانت تێکەڵ نەببوو [٧].

لە ڕاستیدا هێگڵ خوێندنی ئەنستیتۆی زۆر بە دڵ نەبوو، لەبەر ئەوە هەستی دەکرد لە ژیانێکی ڕۆتینیدایە، ئەم ئەنستیتۆیە زیاتر بۆ خوێندنی ئایینی و بۆ پێگەیاندنی پیاوی ئایینی بوو، لەبەر ئەوە بلیمەتی هێگڵ وەك قوتابیەکی زیرەك و چاپووك لەم ئەنستیتۆیەدا دەرنەکەوت[٨].






جگە لەوەی هێگڵ نەیتوانی بلیمەتی خۆی لەم ئەنستیتۆیە دەربخات، هەروەها نەشیتوانی لێهاتوویی خۆی لە بواری فەلسەفەدا پەرەپێبدات، لەبەر ئەوە ویل دیورانت دەڵێت: لە ساڵی ١٧٩٣ هێگڵ بڕوانامەی توبنگنی بەدەست هێنا، کە لە بواری خواناسین (اللاهوت) و فیلۆلۆژیا (فقه اللغه) سەرکەوتوویی خۆی نواند، بەڵام لە بواری فەلسەفەدا سەرکەوتوونە بوو[٩].

لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی فەڕەنسا لە ساڵی ١٧٨٩هێگڵ هەستی دەکرد خەریکە ئەورووپا بەرەو جیهانی ئازادی هەنگاودەنێت، لەبەر ئەوە هاوسۆزییەکی زۆری بەرامبەر ئەو شۆرشە هەبوو، هێگڵ و شلنگ هەموو یەکشەممەیەك لە ساڵی ١٧٩١ بە یەکەوە لە کونجێکی لێواری توبنگن خەریکی چاندنی داری ئازادی دەبوون، لە ڕاستیدا هێگڵ واسەیری شۆڕشی فەرەنسی دەکرد کە هەوڵێکی مەزن بوو گەلی فەڕەنسا ئەنجامیاندا، ئەویش لە پێناو دامەزراندنی ژیانێکی سیاسی لەسەر بنەمایەکی بەتین، کە بنچینەکەی لەسەر باوەڕکردن بە عەقڵ و بانگەشەکردنی ئازادی بێت [١٠] .

لە ساڵی ١٧٩٧ هێگڵ لەسەر قسەی هۆلدرین دەچێتە فرانکفۆرت و دەبێتە مامۆستای تایبەتی خێزانێکی بازرگان، تاوەکو هەواڵی مردنی باوکی پێ دەگات لە فرانکفۆرت دەمێنێتەوە، لە ڕاستیدا هێگڵ بۆ ماوەی شەش ساڵان لە بیرو (Berue) و فرانکفۆرت خەریکی دەرس گوتنەوە بوو، کە بەهۆیەوە بژێوی ژیانی دەست دەکەوت، سەرەڕای ئەوەی لەم کاتەدا بەهۆی دەرسگوتنەوە خەریکی گوزەرانی ڕۆژانەی بوو، هەر لەم ماوەیەشدا قۆناغی بیناکردن و دروستبوونی بیروڕاو فەلسەفەکەی دەستپێکرد، لەم کاتەدا نووسینەکانی (ئەدوارد جیبون و مۆنتسکیو وکانت)ی خوێندەوە، بە تایبەتی کتێبی (ئایین لە سنووری عەقلدا)ی کانتی زۆر بە دڵ بوو، کە بووە هۆی ئەوەی ئەم کتێبە کاریگەری تایبەتی خۆی بەسەرییەوە هەبێت.

له ساڵی ١٧٩٩ كه باوكی هێگڵ دەمرێت، ئەو كاتە میراتێكی زۆری باوكی بۆ دەمێنێتەوە، ئیتر هێگڵ هەست بەوە دەكات كە دەوڵەمەند بووە و باری گوزەرانی چاك بووە، لەبەر ئەوە واز لە دەرسگوتنەوە دەهێنێت، لە نامەیەكیدا بۆ شلنگی هاوڕێی دەنووسێت شوێنێكی وای بۆ دیار بكات كە ژیان و گوزەران تێیدا سادەو ساكارانە بێت و هەروەها شوێنێكی وابێت كە كتێبیشی تێدا دەستبكەوێت، لە وەڵامدا شلنگ شاری (یینا)ی بۆ هەڵدەبژێرێت، ئەو كاتە شیلەر مامۆستای مێژوو بوو لە زانكۆی ئەو شارە (یینا)، بەڵام فیختە و شلنگ تازە لە قۆناغی ئامادەكردنی فەلسەفەكەیاندابوون. شاری (یینا) ئەو كات مەڵبەندی بزووتنەوەی فەلسەفی بوو لە ئەڵمانیا، لەو شارەدا نێوبانگی فەلسەفەی فختە بڵاوببووەوە، شلنگ تازە خەریك بوو لە كۆڕو كۆبوونەوە فەلسەفییەكاندا نێوبانگی پەیدا دەكرد، جا لەبەر ئەوە كارێكی ئاسایی بوو كە هێگڵ لە سەرەتای قۆناغی نوێی ژیانیدا بیری بۆ ئەم شارە (یینا-Jena) بچێت، ئەوە بوو لە بەرواری ٢ نۆڤەمبەری ١٨٠٠ نامەیەك بۆ شلنگ دەنووسێت و داوای لێدەكات سەر لەنوێ وەك دوو هاوڕێ بەیەكتر شادببنەوە(١١).

له راستیدا ئەو كاتەی كە هێگڵ دەچێتە یینا پەرەسەندن و گەشەكردنی فیكری ئەدەبی خەریكبوو بەرەو كپبوون دەچوو، هەروەك (ڕۆزانگرانتس)یش بۆی دەچێت لەبەر ئەوەی فیختە زانكۆی یینای جێهێشتبوو و چووبوو بۆ زانكۆی بەرلین، ئەویش بەهۆی ئەو قەیرانەی كە لە سەر مەسەلەی خواناسین ورژاندبووی، هەروەها گۆڤاری (Athenaum) كە برایانی ئەشپگل دەریان دەكرد، ئەو گۆڤارەی سەرجەم ڕۆمانسییە نوێخوازەكانی كۆدەكردەوە لە كاركەوتبوو، ڕۆمانسییەكان بەهەموو شارەكانی ئەڵمانیادا پەرت و بڵاوبوونەوە، هەروەها لەو كاتەشدا رابەری ڕۆمانسییەكان (نۆڤالس) لە ساڵی ١٨٠٠ كۆچی دوایی كردبوو، دووەم رابەری ڕۆمانسی لودفیچ تیك (Tieck) خۆی دووره پەرێز كردبوو، لە زانكۆی یینادا پرۆفیسۆری بە توانا لە فەلسەفە نەبوو، جگە لە شلنگ نەبێت(١٢).





له ساڵی ١٨٠١ هێگڵ دەچێتە (یینا) بۆ ئەوەی لە پاڵ شلنگدا بووەستێت و بەرگری لە بیروبۆچوونی هاوڕێكەی بكات، لەو كاتەدا بوو كە هێگڵ كتێبێكی بڵاوكردەوە بەناونیشانی (جیاوازی لە نێوان فەلسەفەی فیختە و فەلسەفەی شلنگ) كە زۆر بەتووندی بەرگری لە بیروبۆچوونەكانی شلنگ دەكردو دژایەتی فەلسەفەی فیختەی دەكرد. هێگڵ لە ساڵی ١٨٠٢ لەگەڵ شلنگ لەسەر ئەوە رێككەوت كە هاوكاری ئەو بكات لە دەركردنی بڵاوكراوەیەكی رەخنەیی لە فەلسەفەدا، لەو بڵاوكراوەیەدا هەردووكیان تەعبیریان لە بیروبۆچوونە هاوتەباییەكانیان دەكرد، چونكە لەوكاتەدا (شلنگ و هێگڵ) لەوپەڕی هاوتەبایی فیكری دابوون، هەردووكیان لەو باوەڕەدابوون كە دەبێت خودو بابەت-شت- لەیەكەیەكی بەرزدا یەكبگرن، ئەم دوو فەیلەسووفە نەك هەر تەنیا لەسەر ئەوە رێككەوتن كە گونجاندنێكی دەرەكییان هەبێت، بەڵكو لەسەر ئەوە رێككەوتبوون كە گونجانێكی جەوهەرییان لە نێواندا هەبێت، بەڵام دواتر شلنگ و هێگڵ لەسەر راوبۆچوونێك جیاوازییان كەوتە نێوان، پاشان جیاوازییەكە پەرەی سەند و فراوان بوو. جیاوازییەكەشیان ئەوەبوو كە هەمیشە شلنگ پێی لەسەر ئەو بۆچوونەی خۆی دادەگرت كە كاتێك جیاوازی لە نێوان خودو بابەت —شت- نامێنێت، لەم نێوانەدا پنتێك یاخود خاڵێك هەر دەمێنێتەوە.

بەڵام هێگڵ وای بۆ دەچوو كە ئەو یەكەیە بەرزەی لە خودو بابەت پێكدێت، دەبێت هەموو شتێكی تێدابێت، تەنیا ئەلقەیەك نییە لە نێوان روح لەلایەك ولە نێوان سروشت لەلایەكی دیكەوە، بەڵكو یەكەیەك لە هەمانكاتدا لە خود و لە سروشتیش بەرزترە، بە واتایەكی دیكە هێگڵ لەگەڵ شلنگ لەوەدا ناكۆك بوو كە سروشت بوونێكی دیكەی سەربەخۆی نییە شان بە شانی بوونی عەقڵ، بەڵكو سروشت بەشێكە لە ژیانی عەقڵ (١٣). لەو بڵاوكراوە فەلسەفیەی شلنگ و هێگڵ بەیەكەوە دەریان دەكرد، هێگڵ چەند نووسینێكی فەلسەفی تێدا بڵاوكردەوە، لەو وتارانەش؛ (دەربارەی سروشتی رەخنەی فەلسەفی)، (وتارێك لەسەر نووسینەكانی

هرکروچ Herrkrug )، (ڕێبازی گومانکاری و شولتسەShultzea) و (ئیمان و مەعریفە) و (دەربارەی شێوازی زانستی بۆ لێکۆڵینەوە لە مافی سروشت و شوێنی لە فەلسەفەی زانستیدا و پەیوەندی ئەم شێوازە زانستییە بە زانستەکانی یاسای دانراوەیی). هێگڵ ئەم وتارانەی لە نێوان ساڵانی ١٨٠٢ تاوەکو ١٨٠٣ نووسیبوو.

هەر چەندە هێگڵ لە زانکۆی یینا دەرفەتی دەرسگوتنەوەی پێ دەدرێت، بەڵام چەند قوتابییەکی کەم ئامادەی وانەکانی دەبن، لەبەر ئەوەی هێگڵ بە پێچەوانەی مامۆستاکانی دیکەی وەکو شلنگ و فیختە و شیلەر، زەمانی گران بوو لە قسەکردندا، سەرەڕای ئەوەی قسەکانی تەمومژاوییەکی زۆریان تێدابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قووڵی بیرکردنەوەی هێگڵ قەرەبووی کەمووکوڕییەکانی کردبۆوە، گرنگترین بەرهەمی هێگڵ لە یینا (فینۆمینۆلۆجیای ڕوح The phenomenology of mind) بوو، کە شەوێك پێش شەڕی یینا(١٣ ئۆکتۆبەری ١٨٠٦) هێگڵ تەواوی کردبوو. ئیتر ئەوەبوو داگیرکردنی یینا لەلایەن فەرەنساییەکان بارودۆخی وڵاتی شێواند، دواجاریش هێگڵ ناچار دەبێت ئەو شارە بەجێی بهێڵێت.

کتێبی (فینۆمینۆلۆجیای ڕوح) ئەوەی نیشان دەدا کە هێگڵ بەرەو ڕێگای تایبەتی خۆی دەچوو لە فەلسەفەدا، خەریکبوو بە تەواوی دەستبەرداری فەلسەفەی شلنگ ببێت و لەژێر کاریگەری ئەودا ڕزگاری ببێت، بابەتی سەرەکی ئەم کتێبەی هێگڵ بریتی بوو لەوەی، کە چۆن هۆشیاری لە پلەیەکی نزمەوە بەرەو پلەیەکی بەرزتر دەچێت، تاوەکو ئەو هۆشیارییە بەرەها دەگات و لەگەڵ ڕەهادا دەبنە یەك.

لەناو تەوژمە ڕۆشنبیری و فەلسەفییەکانی زانکۆی یینا و بزووتنەوەی ڕۆمانتیکی و تەنویردا هێگڵ توانی جێگایەکی تایبەتی بۆ خۆی بکاتەوە و سیستەمێکی نوێ بهێنێتە کایەوە.. هێگڵ وەکو زانایانی فێرگەی هەستەکی (المدرسة التجريبية) و کانت لای وایە لە ئەزموونی هەستەکییەوە سەرەتای زانین دەست پێدەکات و دیالیکتیکەکەی دەکەوێتە ڕێ، واتە بە پێچەوانەی ئەفلاتۆن و دیکارتەوە، هێگڵ زانیاری هەستەکی ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵکو بە قۆناغی یەکەمی



زانینی داناوەو لە هەمانکاتیشدا لای وابووە ئەم قۆناغە وەکو هەموو قۆناغەکانی تری دیالیکتیك کەموکوڕی و ناکۆکی تێیدایە، عەقڵ پێویستە لێرەدا نەوەستێ و گەشتەکەی بەرەو قۆناغێکی بەرزتر و نزیکتر لە ڕاستییەوە بخاتەڕێ [١٤].

وشەی ڕوح بەو مانایەی کە هێگڵ بەکاری دەهێنێت لە زمانی ئەڵمانیدا پێی دەگوترێت (Geist )، ئەم وشەیەش لە ئینگلیزیدا هەندێك وشەی (Spirit ) ی لە بەرامبەردا بەکاردەهێنن، هەندێکی دیکە لە وەرگێڕەکانی زمانی ئینگلیزی وشەی (Mind ) -کە واتای عەقڵ دەگەیەنێت- لە بەرامبەر ئەم وشە ئەڵمانیەدا بەکاردەهێنن، بیری ڕەها لای هێگڵ مانای ڕوح دەگەیەنێت، بەڵام دەشتوانرێت بەو بیرە ڕەهایە بگوترێت عەقڵ یاخود فیکر، لۆجیکیش وەسفێك بووە بۆ عەقڵی ڕەها، یاخود وەسفێك بووە بۆ عەقڵی یەکەم کە پێش بوونی جیهان هەبووە، یاخود وەسفی خواوەندە لە خودی خۆیدا پێش ئەوەی خۆی بنوێنێت، بەڵام ئەو عەقڵەی کە لۆجیك وەسفی دەکات عەقڵێکی پەتییە و بوونێکی فیعلی نییە، لەبەر ئەوەی هێشتا دەرنەکەوتووە، ئەو عەقلە پەتییە لە سروشتدا دەگۆڕێت بۆ دژەکەی، واتا دەگۆڕێت بۆ نامەعقوڵ، ئەم نامەعقولەش دەرچوونە لە سروشت، بەڵام لە فەلسەفەی ڕوحی هێگڵ ئەو عەقڵە دەگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی، واتە عەقڵێکی پەتی نییە، بەڵکو ئەو عەقڵ و ڕوحەیە کە دەرکەوتووە، ئەو عەقڵ و ڕوحەیە کە لەبوونی فیعلی-بەرجەستەیی- جیهاندا هەیە [١٥].

کەواتە لە تێگەیشتنی هێگڵیدا عەقڵ و ڕوح یەك مانایان هەیە، بەڵام ئاخۆ عەقڵ یاخود ڕوح چۆن خۆی دەردەخات؟ بە شێوەیەکی گشتی دەتواندارێت بڵێین کە عەقڵ بەم سێ قۆناغە تێدەپەڕێت: یەکەم قۆناغی هۆشیاری ڕاستەوخۆ، لەم قۆناغەدا بابەت سەربەخۆ لەبەرامبەر زاتدا دەردەکەوێت کە ئەو زاتەی یان ئەو خودەی دەرکی پێ دەکات، دووەم قۆناغی هۆشیاری زاتییە، لەم قۆناغەدا حەقیقەتی بابەت دەردەکەوێت کە بوویتە زات یاخود لەگەڵ زاتدا ئاوێتەبوون و مەحاڵە





بتواندرێت لە یەکتر جیابکرێنەوە، لەبەر ئەوە لەم قۆناغەدا ئەو جیاوازییەی نێوان بابەت و زات لە قۆناغی یەکەم — هۆشیاری راستەوخۆ- نامێنێت.

سێیەم قۆناغی عەقڵ، لەم قۆناغەدا بابەت لەگەڵ خوددا یەکدەگرن، لەهەمانکاتیشدا لەگەڵ یەکتردا جیاوازن، لێرەدا هێگڵ بە تێروانینێکی دیالیکتیکانە سەیری ئەم پەرەسەندنەی عەقڵ دەکات[١٦].

کتێبی (فینۆمینۆلۆجیای روح) بە گەورەترین و گرینگترین بەرهەمی هێگڵ دادەنرێت و بەتایبەتی لەو کاتەی کە ئەو بیرمەندە لە شاری یینا نیشتەجێ ببوو، هەر لەبەر ئەوەشە زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان کاتێک دەیانەوێت باسی ئەم کتێبەی هێگڵ بکەن لە ژێر ناونیشانی (قۆناغی یینا) وە باسەکەیان دەست پێ دەکەن، بۆ نموونە ئەو کتێبەی کە جان هێپولیت (لێکۆڵینەوە سەبارەت مارکس و هێگڵ ) نووسیوویەتی، لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا لە ژێر ناونیشانی (ژیان و هۆشیاری ژیان لە فەلسەفەی یینای هێگڵیزم= الحياة و الوعي الحياة في فلسفة ايينا الهيجلية) ، هێپۆلیت باس لە فینۆمینۆلۆجیای روح دەکات[١٧]، ئەم قۆناغەی فەلسەفەی هێگڵ بە قۆناغی گەشەکردن و نەشونماکردنی فەلسەفەکەی دادەنرێت، لەبەر ئەوەی تایبەتمەندی فەلسەفەی هێگڵ لەم قۆناغەدا بناغەی خۆی دادەڕێژێت.

هەندێك لە لێکۆڵەرەکان لەو باوەڕەدان کە هێگڵ لە ژێر فشاری بارودۆخێکی تایبەتی ئەم بەرهەمەی بڵاوکردۆتەوە، لەبەر ئەوەی هێشتا پلانی فەلسەفەکەی بە تەواوی لە مێشکدا پێ نەگەیشتبوو، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە خەریکی چاپکردنی ئەم کتێبەی بوو، ئەو لێکۆڵەرەوانە وای بۆ دەچن کە هێگڵ لە هەریەك لە پەرەگرافەکانی ئەم کتێبەی مەبەستی ئەوە بووە کە پێشەکییەك دەربارەی رێبازەکەی خۆی بخاتەڕوو، بەڵام ئەم پێشەکییەبووە خستنەڕوویەکی فراوانی رێبازێکی فەلسەفی نوێ، لە راستیدا هێگڵ لەو کتێبەیدا ویستوویەتی رەخنە لە فەیلەسووفەکانی پێش خۆی بگرێت لە بارەی مەسەلەی حەقیقەتی مەعریفەوە، ئەویش بۆ رێگا خۆشکردن لە پێناو جێگیرکردنی بۆچوونی مەعریفەی رەها.[١٨]





ئیتر بەم جۆرە لەم کتێبەوە هێگڵ دەتوانێت بەتەواوی دابڕانی خۆی لەگەڵ رۆمانسییەکان و لەگەڵ شلنگ رابگەیەنێت.

لەگەڵ داگیرکردنی شاری یینا لەلایەن فەرەنسییەکان شوێنی هێگڵ لەق بوو، لەبەر ئەوە ناچار بوو خۆی لە ماڵی یەکێك لە قوتابییەکانی بشارێتەوە، تاوەکو بارودۆخەکە نەختێك ئارام دەبێتەوە، کریستیان شارلون کە ژنی خزمەتکارێك بوو مێردەکەی جێی هێشتبوو، لە بەرواری ٦-فبرایر-١٨٠٧منداڵێکی ناشەرعی لە هێگڵ دەبێت و ناوی (لودڤیچ)ی لێ دەنێت، کە دواتر ئەو منداڵە ناشەرعییە زۆر کێشە و تەنگوچەڵەمە بۆ هێگڵ دروست دەکات، تا دواجار هێگڵ ناچار دەبێت لە ساڵی ١٨١٦ناوی ئەو منداڵە بخاتە سەر ناوی  بنەماڵەی خۆی.

لە ساڵی ١٨٠٧ هێگڵ دەچێتە بامبرگ (Bumderg) و دەبێتە سەرنووسەری (رۆژنامەی بامبرگ) و تاوەکو ساڵی ١٨٠٨ لە رێگای ئەم رۆژنامەوە دەتوانێت گوزەرانی رۆژانەی خۆی دابین بکات، هێگڵ لە نامەکانیدا بۆ هاورێکانی نائارامی خۆی لەم شارەدا نیشان دەدات، ئەوەبوو(نیتامر)ی هاورێی ئەو شلنگی هاورێی بەدواییدا دەنێرێت، بۆ ئەوەی لەو نائارامییە رزگاری بکات، ئەوەبوو (هێگڵ)ی رەوانەی شاری نۆرمبۆرگ کرد، تاوەکو ببێتە بەڕێوەبەری ئامادەیی کلاسیکی نوێ لەو شارەدا و وانەی فەلسەفەش لەم قوتابخانەیە بڵێتەوە.[١٩]

هەر لەوکاتەی کە هێگڵ شاری یینا بەجێ دەهێڵێت ئەو قۆناغەی فەلسەفەکەی تێ دەپەڕێنێت کە بە قۆناغی یینا ناسراوە، لەبەر ئەوە لە کۆتایی هاتنی قۆناغی یینا هێگڵ واز لە بیرکردنەوە لە فەلسەفەی پراکتیکی دەهێنێت، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر گرنگیدان بە کێشە میتافیزیقییە گەورەکان کە بەدرێژایی ژیانی پانتایی فیکری ئەوی داگیرکردبوو، بەرچاوترین ئەو کێشە میتافیزیقییانەش بریتییە لە کێشەی پێکهێنانی تێڕوانینێکی هەمەلایەنی یاخود نەسقێکی گشتی دەربارەی بوون، مێژوونووسانی بیری هێگڵ ئەو ماوەیەی نێوان ساڵانی ١٨٠٥تاوەکو ساڵی ١٨٠٦یان لە فەلسەفەی (هێگڵ) بە (فەلسەفەی واقع –( Rral Philosophic )

ناوزەد کردووە، ئەم قۆناغە بریتی بووە لە لێکۆڵینەوە لەسەر فەلسەفەی سروشت و فەلسەفەی روح، واتە لەو قۆناغەدا هێشتاکە (لۆجیك) نەببووە بەشێکی سەرەکی لە بیرکردنەوە و فەلسەفەی هێگڵ کە دواتر لە دابەشکردنی ئەم فەلسەفەیە بۆ سێ بەش (لۆجیك و سروشت و روح) لۆجیك بەشی یەکەم پێکدەهێنێت.

لە راستیدا لەم قۆناغەدا هێگڵ گرنگی بە تەفسیرکردنی تیۆریی دەربارەی واقیعی ئەزموونی و کۆنکریتی (العینی) دەدات، هێگڵ لە نووسینەکانیدا لەم قۆناغەدا لە (هۆشیاری) و (شعور) دەکۆڵێتەوەو ئەویش بەو پێیەی کە هۆشیاری یەکەمین شێوازە لە شێوازەکانی روح، هەروەها باس لە هەموو جۆرەکانی هێزی هۆشیاری و شعور دەکات، هێزی یەکەم هێزی بیرەوەری و زمانە (قوة الذاکرة واللغة)، هێزی دووەم: هێزی ئارەزووە (الرغبة)، دوا هێز هێزی سێیەم هێزی روحی خێزانی و ژیانی هاوسەرێتییە، هێگڵ لە ژیانی خودی رووتەوە دەست پێ دەکات تاوەکو دەگاتە بەرزترین پلەی یەکگرتنی نێوان خود و بابەت .[20]

لە ساڵی ١٨١١ هێگڵ ماریا ڤون توچەر(Maria Uon Tucher) ی بە هاوسەری ژیانی هەڵدەبژێرێت، کە کچی یەکێك لە بنەماڵە بەنێوبانگەکانی شاری نورنبورگ بوو، دیارە بە درێژایی مێژووی فەلسەفە، فەیلەسووفەکان عادەتێکیان هەبوو کە هەرگیز لە خەمی پێکهێنانی ژیانی هاوسەرێتیدا نەبوون، زۆر بە دەگمەن نەبێت، نەوەك فەیلەسووفەکان زۆر بەیان لە ژیانیاندا ژنیان نەهێناوە و بە رەبەنی ژیانیان بردۆتە سەر، ئەم عادەتەی فەیلەسووفەکان بە درێژایی سەدەکانی شانزەو هەڤدەو هەژدەم بەردەوام بوو، جۆرج ئەنوابرۆنۆ، کمپانلا، دیکارت، سپینوزا، مالبرانیش، لیبنتیز، ڤۆلف، لوك، هیوم، کانت، ئەم فەیلەسووفانە هەموویان بەرەبەنی ژیاون و ژنیان نەهێناوە، دیارە سەرقاڵبوونیان بە بیرکردنەوەی رووت و میتافیزیقیا و ئایدیای بەرز کەشوهەوایەکی سۆفیگەرییانەیان بۆ فەیلەسوفەکان خوڵقاندبوو، کە دەرفەتی ئەوەیان نەبووە بیر لە ژیانی هاوسەرێتی بکەنەوە، بەڵام دواتر ئەوە بوو فیختەو پاشان بە کاریگەری ئەوەوە شلنگ و دواتریش هێگڵ ئەو



عادەتەی فەیلەسووفەکانی پێش خۆیانیان پەیڕەو نەکردو ئەم ڕێسایەیان پێشێل کردو ژنیان هێناو هەوڵی پێکهێنانی ژیانی هاوسەرێتیاندا.

ئەگەر هێگڵ خاوەن بیروباوەڕ و تێڕوانینی ئەبستراکتی بێت ئەوە خێزانەکەی ماریا لە هەموو جۆرە بیرکردنەوەو لێوردبوونەوەیەکی تیۆری بەدەربوو، بەڵام پێ دەچێت پەیوەندییەکی خۆشەویستی پتەو لە نێوانیاندا هەبووبێت، لەبەر ئەوە هێگڵ لە دوو شیعردا باس لە هەست و سۆزێکی بەجۆشی خۆی دەکات لەبەرامبەر ماریادا، هەر دوو شیعرەکەشی بەناونیشانی (بۆ ماریا) یە کە یەکەمیانی لە ١٣ ئەپریلی ١٨١١و دووەمیانی لە ١٧ ئەپریلی هەمان ساڵدا نووسیوە[21].

باوکی ماریا ئەندامی ئەنجوومەنی پیرانی نورنبورگ بوو، یەکێك لە مەرجەکانی شوکردنی کچەکەی بە هێگڵ ئەوە بوو کە دەبووایە هێگڵ پلەو پایەیەکی بەرزی هەبێت و ببێتە پرۆفیسۆر لە یەکێك لە زانکۆکان بە مووچەیەکی باش، لەبەر ئەوەی هێگڵ لە نورنبورگ موچەیەکی کەمی وەردەگرت، لە نامەکانیدا تکا لە (نیتامر) دەکات بۆ ئەوەی بە پلەو پایەیەکی بەرز لە زانکۆدا دایبمەزرێنێت. (نیتامر) وەڵامی هێگڵ دەداتەوە و دڵنیای دەکاتەوە لەوەی کە دایدەمەزرێنێت، بەڵام داوای لێ دەکات کەمێك پشووی درێژبێت، پاشان لە نامەکەیدا کە وەڵامی هێگڵ دەداتەوە پرسیاری لێ دەکات، کە ئاخۆ ئەو لەوە دڵنیا نییە کە پلەو پایەیەکی بەرزی هەیەو شایستەی ئەوەیە کە بە ئاشکرا پێشوازی لە خواستنی کچی بنەماڵەیەکی گەورەی شاری نورنبورگ بکات؟ ئەوەبوو هێگڵ لە ١٦ سپتێبمەری ١٨١١ ماریا دەگوازێتەوەو تاوەکو مردن ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ یەکتردا بەسەر دەبەن و دوو کوڕیان دەبێت: کارل١٨١٣-ئەمانوئیل ١٨١٤.

لەو کاتەی کە هێگڵ دەبێتە بەڕێوەبەری ئامادەیی نورنبورگ کە بۆ ماوەی نزیکەی هەشت ساڵان لەم کارەیدا بەردەوام دەبێت، لەو کاتەدا(نیتامر) کە پلەو پایەیەکی بەرزی لە وەزارەتی پەروەردەو فێرکردنی هەرێمی بڤاریا Bavariaدا هەبوو، داوا لە هێگڵ دەکات کتێبێك دەربارەی لۆجیك بنووسێت بۆ ئەوەی

قوتابییەکانی ئامادەیی لەسەری بخوێنن، لە راستیدا هێگڵ ئەم داواکارییەی (نیتامر)ی بە دڵ نەبوو، لەبەر ئەوەی دوای دەرچوونی کتێبی (فیتۆمنیۆلۆجیای روح) هێگڵ خەریك بوو ببێتە خاوەن رێبازی تایبەتی خۆی لە فەلسەفەدا، دوای ئەوەی لەم کتێبەیدا بنەما سەرەکییەکانی فەلسەفەکەی بە شێوەیەکی قووڵ خستەڕوو، ئیتر پێویستی بەوە هەبوو کە بنچینەیەکی عەقڵی بۆ رێبازەکەی دابرێژێت.

دەبوایە  هێگڵ دەربارەی لۆجیکی تایبەتی خۆی بنووسێت نەك دەربارەی لۆجیکی وێنەیی (المنطق الصوري) کە هەر لەسەردەمی فەلسەفەی یۆنانیدا باوبوو تاوەکو سەردەمی هێگڵ شێوازێکی باوی لۆجیك بوو، بەم جۆرە دەبینین هێگڵ زۆر بە راشکاوی وەڵامی (نیتامر) دەداتەوەو دەڵێت زۆر کتێب دەربارەی لۆجیکی تەقلیدی هەن کە دەشێن لە قوتابخانەدا بخوێندرێت، بەڵام ئەم  بابەتانە لەوانە نینە کە بۆ هەمیشەیی بەم جۆرە بمێنێنەوە کەچی هێشتا ئەلتەرناتیڤی ئەم لۆجیکە تەقلیدییە دەرنەکەوتووە.

وا دەردەکەوێت کە هێگڵ ئەو کاتە سەرقاڵی ئەلتەرناتیڤێکی لۆجیکی وێنەیی بووبێت، لەبەر ئەوە سەلیقەی ئەوەی نەبوو کە خۆی بەلۆجیکی تەقلیدی خەریك بکات، ئەوەبوو بەرگی یەکەمی لۆجیکی بە دووبەش لە ساڵی ١٨١٢و ١٨١٣ بلاوکردەوە، دواتر بەرگی دووەمی لە ساڵی ١٨١٦بلاوکردەوە، ئەم دوو بەرگەی (لۆجیك) کە بەلۆجیکی گەورە ناسراون، بنچینەیەکی عەقڵی بوو بۆ رێبازەکەی هێگڵ. لەبەر ئەوە لە دووتوێی ئەم کتێبەیدا هێگڵ ویستوویەتی سەر لەنوێ راوبۆچوونەکانی خۆی لە چوارچێوەی پوخت و هەمەلایانانەدا دابرێژێتەوە، تاوەکو نەسقێك لە راو بۆچوونەکانی بخاتەڕوو.

لەم کتێبەیدا هێگڵ نایەوێت وەکو کانت رەخنە بگرێت یاخود وەکو فیختە پرنسیپێك پێشکەس بکات، یاخود وەکو شلنگ روانگەیەکی سەرپێیانەو خێرا لە بوارەکانی سروشت و مێژوو بخاتەڕوو، بەڵکو هێگڵ هەوڵی داوە بە ئەرکێکی گرنگ



و قورس هەڵبستێت ئەویش هەنگاو بەهەنگاو سەر لەنوێ دارِشتنەوەی پارچەپارچەکانی عەقڵێکی هەمەلایەنییە لە یەك هەمەلایەنی سەرتاپاگیردا [٢٢].

جا لەبەر ئەوە هەردوو بەرگی کتێبی (لۆجیك) یاخود (زانستی لۆجیك) رێگای بۆ هێگڵ خۆشکرد کە لە ئامادەیی نورنبورگ پلەیەکی بەرزتری دەست کەوێت و بچێتە زانکۆی هایدلبرگ.

لۆجیك لە رووی شێوازەو بە پێی بۆچوونی هێگڵ سێ لایەنی هەیە:

یەکەم: لایەنی ئەبستراکتی یاخود لایەنی تێگەیشتن.

دووەم: لایەنی دیالیکتیکی یاخود لایەنی نێگێتیڤی عەقڵی.

سێیەم: لایەنی تیۆری یاخود لایەنی پۆزەتیڤی عەقڵی .

هێگڵ دەڵێت: ئەم سێ لایەنەش سێ بەشی لۆجیك پێك ناهێنن، بەڵکو سێ قۆناغ یاخود سێ ساتن لە هەر بیرۆکەیەکی لۆجیکی (واتە لەهەر بیرۆکەیەکی هەمەلایەنی **(فکرة شاملة)** و لەهەموو حەقیقەتێکدا).[٢٣]

هێگڵ دوای ئەوەی لە رووی شێوازەوە ئەم سێ لایەنەی لۆجیك دیار دەکات، دواتر ناوەڕۆکی لۆجیك بۆ سێ بەش دابەش دەکات .

یەکەم: تیۆری بوون، دووەم: تیۆری ماهییەت، سێیەم: تیۆری بیرۆکە یاخود (بیرۆکەی هەمەلایەنی).[٢٤]

بەم جۆرە سێکوچکەی بیرکردنەوەی فەلسەفەی هێگڵ سەرەتا لە سێ ئەڵقەی گەورە پێك دێت، هەریەك لەم ئەڵقەنە سێ ئەڵقەی بچووکتر بەخۆەوەدەگرن،  ئەمەش سێکوچکەی بیری هێگڵ لە بواری دیالیکتیکدا بەرێوەی دەبات.

لۆجیکی هێگڵ لە تیۆری بووندا سەرەتا لە خودی بوون دەکۆڵێتەوە، بوون چییە و چۆنە؟ پاشان پەیوەندی ئەم  بوونە بە بوونەکانی دیکەوە، ئەو کاتەش ماهییەتی بوونەکە دەردەکەوێت، کە لەناو رووکەشی بوونەکە خۆی مەڵاس داوە، لە دوای دۆزینەوەی ماهییەتی بوون، ئینجا بە بیرۆکەیەکی هەمەلایەنی دەگات، ئەم پرۆسەیە لە لۆجیکی هێگڵدا دیالیکتیك بەرێوەی دەبات هەروەك چۆن روحی خودی





وەردەچەرخێت بۆ روحی بابەتی ئینجا بە روحی رەها دەگات. لێرەدا لەوانەیە پرسیاری ئەوە بکرێت کە ئاخۆ دیالیکتیکی هێگڵ پرۆسەیەکی بەردەوامە یاخود دەوەستێت؟ گومانی تێیدا نییە کە کاتێك هێگڵ باس لە روحی رەها دەکات بە لوتکەی پەرەسەندنی روحی دادەنێت.

حەتمەن ئەو کاتەش دیارە پرۆسەکە کۆتایی پێ دێت، لێرەدا لایەنی ئایدیالیزمی دیالیکتیکی هێگڵ بەرچاو دەکەوێت، کە دواتر کارل مارکس وەك میراتگری هێگڵیزمی چەپ دیالیکتیکەکەی هێگڵ لە قاوغە ئایدیالیزمییەکەی دەردەهێنێت و بەرگێکی مەتریالیزمی دەکاتە بەر، لەبەر ئەوە دەڵێت: مێتۆدی دیالیکتیکی من نەك هەر لە بنەمادا لە میتۆی هێگڵ جیاوازە، بەڵکو پێچەوانەی میتۆدەکەی ئەوە، چونکە من مەتریالیزمیم، لەکاتێکدا هێگڵ ئایدیالیزمییە، دیالیکتیکی هێگڵ شێوازێکی بنچینەیی هەموو جۆرە دیالیکتیکە، بەڵام کاتێك ئەم دیالیکتیکە لەلایەنە سۆفیزمییەکەی دادەماڵدرێت، ئەو کاتە لە میتۆدەکەی من جیادەکرێتەوە، دیالیکتیك لای ئەو لەسەر سەر دەڕوات، ئەوەندە بەسە کە ئەو دیالیکتیکە بخەینەوە سەرقاچەکانی تاوەکو سیمایەکی تەواو مەعقولی هەبێت.[٢٥]

دوای ئەوەی کتێبی (لۆجیك) لە دوای کتێبی (فینۆمینۆلۆجیای روح) نێوبانگی فەلسەفەی هێگڵ بە هەموو ئەڵمانیادا بڵاودەکاتەوە، لە بەرواری ٣٠ یولیو ١٨١٦ راگری کۆلیجی هایدلبرگ کە ناوی (داوب _Daub) بوو نامەیەك بۆ هێگڵ دەنووسێت و داوای لێ دەکات ببێتە مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی هایدلبرگ .
داوب لە نامەکەیدا پێی دەڵێت ئەگەر بەم داوایە رازی بێت، ئەو کاتە بۆ یەکەم جار شاری هایدلبرگ فەیلەسووفێك بەخۆوە دەگرێت ئەو فەیلەسووفەش تۆی، (پێشتر سپینوزا داوەت کرابوو، بەڵام ئەم داوەتە سەری نەگرت، بێ گومان ئەمەت دەزانی)... ئەو شتی دیکەی پێیە، هەرچەندە خەڵکانێکی کەم جگە لێرە دەیناسن،..)[٢٦] .





هێگڵ خێرا وەڵامی نامەکەی (داوب) دەداتەوە و رازی بوونی خۆی نیشان دەدات و داوای لێ دەکات کە هەوڵی ئەوەی بۆ بدات کە باری گوزەرانی لەم شارەدا باش بێت. ئەوەبوو لە ٢٨ ئۆکتۆبری ١٨١٦ هێگڵ بووە پرۆفیسۆری فەلسەفە لە زانکۆی هایدلبرگ، لە یەکەم وانەیدا هەست بەبێ ئومێدی دەکات و لە کاغەزێکی بۆ ماریای خێزانی باس لەوە دەکات کە قوتابییەکانی کەم ئامادەیی وانەکانی دەبن، بەڵام لەو شارەدا چەند هاوڕێیەك پەیدا دەکات کە گرنگی تایبەتی پێ دەدەن، لەوانەش گۆتلۆب پاولس Gottlob Paulus و هینرش ئەبرهرد Heinrich Eberhard.

هێگڵ لە ساڵی ١٨١٧ ئەو لێکچەرانەی کە لە زانکۆ پێشکەشی کردبوو بەناونیشانی (ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان) بڵاودەکاتەوە.

لە راستیدا یەکەم گرفتێك کە هێگڵ لە زانکۆی هایدلبرگ تووشی ببوو ئەوە بوو کە پێویستی بە کورتکراوەیەکی کتێبی(لۆجیك) هەبوو، تاوەکو لە لێکچەرەکانی زانکۆدا پشتی پێ ببەستێت، ئەوکاتەش لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا ئەوە باوبوو کە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆ لەکاتی پێشکەشکردنی لێکچەرەکانیان پشتیان بە کورتکراوەی کتێبی قوتابخانەی ئامادەیی دەبەست، لەبەر ئەوەی هێگڵ (فینۆمینۆلۆجیای روح) و (لۆجیکی) بڵاوکردبۆوە، بەڵام ئەم دوو کتێبەی قەبارەی گەورەبوو، دەبوایە کورتبکرێتەوە بۆ ئەوەی پێشکەش بە قوتابییەکانی زانکۆ بکرێت[٢٧]. ئیتر بەم جۆرە هێگڵ لەمیانەی پێشکەش کردنی لێکچەرەکانی لە زانکۆی هایدلبرگ (ئینسکلۆپیدیای فەلسەفە)ی بڵاوکردەوە کە تێیدا باس لە لۆجیك و فەلسەفەی سروشت و فەلسەفەی روح دەکات، ئەم کتێبەی هێگڵ بەشێوەیەکی چڕو پڕ هەموو لایەنەکانی فەلسەفەی هێگڵ دەخاتە ڕوو، لەبەر ئەوەی لەم کتێبەدا هێگڵ بە کورتی باس لە لۆجیك دەکات کە پێشتر بە فراوانی بە دوو بەرگی بڵاوی کردبۆوە کە بە لۆجیکی گەورە ناسرابوو، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو بەشەی ئینسکلۆپیدیای فەلسەفە کە باسی لۆجیك دەکات بە لۆجیکی بچووك ناسراوە.

کەواتە هەوڵ و کۆششی بیرکردنەوەکانی هێگڵ لە یینا کتێبی (فینۆمینۆلۆجیای روح) بوو، لە نورنبرگ (لۆجیك) و لە هایدلبرگ (ئینسکلۆپیدیای فەلسەفە)بوو، جا لەبەر ئەوەی لەم کتێبەی دواییدا هێگڵ فەلسەفەکەی خۆی چڕ کردبۆوە، لەبەر ئەوە ئەم قۆناغە لە فەلسەفەی هێگڵدا بە کۆتایی قۆناغەکانی پێشتری دادەنرێت، هەروەها بە دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ لە فەلسەفەی ئایدیالیزمی رەها لە قەڵەم دەدرێت، لەبەر ئەوە هێگڵ هەرچەندە لە شاری هایدلبرگدا هەستی بە کامەرانی و بەختیاری ژیان دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەرکی بەوە کردبوو کە پلەو پایەی فیکری و فەلسەفی ئەو پێویستی بە شوێنێکی بەرچاوتر هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت لە ئاستێکی بەرزتر و فرەوانتر خۆی بنوێنێت، لەبەر ئەوە کاتێك فیختە کۆچی دوایی کرد، هێگڵ خەونی بەوە دەدیت بچێتە زانکۆی بەرلین و شوێنی ئەو بگرێتەوە، ئەوەبوو یەکسەر ئەو خەونەی هاتەدی کاتێك زگموند ڤۆن ئەلتنشتین (١٧٧٠-١٨٤٠) بووە وەزیری فێرکردن لە ساڵی ١٨١٧، ئەوەبوو لە٢٦سپتێمبەری هەمان ساڵ لە کاغەزێکی بۆ هێگڵ دەنووسێت: کە بە داخەوە ساڵی پێشوو بەو مەرامەی نەگەیشت کە بچێتە زانکۆی بەرلین، بەڵام ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە بەمەرامەکەی بگات و هیوای ئەوە دەخوازێت کە رای خۆی نەگۆرێت لەو بارەوە[٢٨].

ئیتر هێگڵ کە چاوەڕوانی ئەم دەرفەتەی دەکرد بەم داواکردنە زۆر دڵخۆش دەبێت و لە بەرواری ١٢ سپتێمبەری ١٨١٨ کە هێشتاکە لە هایدلبرگ بوو بە خوشکەکەی دەڵێت کە لە ١٨سپتێمبەر دەچێتە بەرلین و داخی ئەوە دەخوات کە ئەم شوێنە جوانە بەجێ دەهێڵێت، پاشان دەڵێت: (بەڵام تەنیا بەرلین مەڵبەندێکی مەزنە، لە باکووری ئەڵمانیا زیاتر گرنگ بە فەلسەفە دەدرێت، و خەڵك لەو ناوچانە زیاتر لە خەڵکی باشوور هەست بە پێویستی فەلسەفە دەکەن ) [٢٩] .

هێگڵ سێزدە ساڵان لە زانکۆی بەرلین مایەوە، تاوەکو مردنی هەر لەم زانکۆیەدا خەریکی وانە گوتنەوەبوو، بەناوبانگترین قوتابییەکانی هێگڵ لەم کاتەدا بریتی بوون لەمانە: جانز (Cans) و مارهینکە وبومان و ئەردمان و روزنکرانتس و کونوفیشر،



هەندێك لەو قوتابیانەی هێگڵ بە رادەیەك بە هێگڵەوە پەیوەست بوون کە دەیان گوت هەر کەسێك باوەڕی بە ڕێبازی فەلسەفەی هێگڵی نەبێت گەمژەو نەزانە[٣٠].

ڕێبازی فەلسەفەی هێگڵ خەریك بوو دەبووە فەلسەفەی سەرەکی دەوڵەت، لەبەر ئەوە هەر کەسێك باوەڕی پێ نەکردبایە هیچ کارێکی لە دەوڵەت دەست نەدەکەوت، تەنانەت پرۆفیسۆرێکی دەروونناسی ئەزموونگەری لەبەر ئەوەی رەخنەی لەلایەنی ئایدیالیزمی فەلسەفەی هێگڵ گرتبوو لە زانکۆ دەرکرا، گرنگترین بەرهەمی فەلسەفەی هێگڵ لە بەرلین بریتی بوو لە هەر دوو کتێبی (پرنسیپی فەلسەفەی ماف) و (چەند وانەیەك لە فەلسەفەی مێژوو)، هێگڵ لەم قۆناغەی ژیاندا زۆر لە خۆی رازی بوو، لەبەر ئەوەی قوتابی و رۆشنبیرانێکی زۆر لە دەوری کۆببوونەوە، ئەمە جگە لەوەی کە هێگڵ خەریك بوو لەسەر ئاستێکی بەرزی رۆشنبیری و فەلسەفیدا لە ئەڵمانیا و ئەوروپادا دەناسراو بەو هۆیەوە هێگڵ پەیوەندی لەگەڵ زۆربەی کەسایەتییە ئەدەبی و فەلسەفییەکانی سەردەمی خۆی پەیداکردبوو، بە تایبەتی گۆتە و فکتۆر کوزان، هێگڵ لەوکاتەدا بە مامۆستای رۆشنبیری فەلسەفی ئەڵمانیا دادەنرا و زۆربەی زانکۆکانی ئەڵمانیا کەوتبوونە ژێر کاریگەری رێبازە فەلسەفییەکەی، کاتێکیش بەنەخۆشی کۆلێرا لە بەرواری ١٤ تشرینی دووەمی ١٨٣١ کۆچی دوایی کرد بە ئاپۆرەیەکی گەورەی قوتابی و لایەنگرو هاوڕێکانی بەرەو دوامەنزڵگای بەرێ کرا، لەسەر خواستی خۆی لە تەنیشت فیختەی فەیلەسووف نێژرا. [٣١]

هێگڵ تاوەکو لە ژیاندا بوو تەنیا ئەم سێ کتێبەی بڵاوکردبۆوە (فینۆمینۆلۆجیای روح) و (لۆجیك) و (ئینسکلۆپیدیای فەلسەفە)، بەڵام دیارە جەوهەری فەلسەفەی هێگڵ لەو لێکچەرانەدایە کە لە یینا و نوونبرگ و هایدلبرگ و بەرلین پێشکەش بە قوتابییەکانی کردبوو، کە دوای مردنی قوتابییەکانی و هاوڕێییەکانی بڵاویان کردەوە، ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٣٢(هـ.ج.هوتو) (ئیستاتیکای هێگڵ) ی بڵاوکردەوە، مارهاینکە لە هەمان ساڵدا فەلسەفەی ئاینی بڵاوکردەوە،





پاشان له ساڵی ١٨٤٠به تەواوی له چاپێکی دیکەدا بڵاویکردەوه، ك.ل. میشلیه له ساڵی ١٨٣٢(چەند لێکچەرێك له فەلسەفەی مێژوو) ی بڵاوکردەوه، هەروەها جانز له ساڵی ١٨٣٧ دیسان بڵاوی کردەوه، پاشان کارل هێگڵ له ساڵی ١٨٤٠بڵاوی کردەوه، بەڵام دواتر به هەندێ زیادەکارییەوه بڵاوکرایەوه، فۆن هنینك له ساڵی ١٨٤٠(لۆجیك) و ك.ل. میشلیه له ساڵی ١٨٤٢ فەلسەفەی سروشت و له ساڵی ١٨٤٥ بۆمان (فەلسەفەی روح) یان بڵاوکردەوه.

بەهۆی دەوڵەمەندی و فراوانی فەلسەفەی هێگڵ ئەم فەلسەفەیه تەفسیرو لێکدانەوەی جیاجیای بۆ کراوه، ئەوەبوو دوای مەرگی هێگڵ قوتابی و لایەنگرانی بوونه دووبەش، بەشێکیان بریتیبوون له باڵی راستی هێگڵێزم که لایەنگری لایەنی ئایینی تەقلیدی هێگڵ بوون، باڵەکەی دیکەش باڵی چەپی هێگڵێزم بوون که فەیلەسووفه مەتریالیزمییەکان بوون به ناوبانگترینیان شتراوس و فیورباخ و مارکس بوون.

ئەو ململانێیه نێوان ئەم دوو باڵەی فەلسەفەی هێگڵی سەرتاپای ئەوروپای گرتەوه، له ئینگلتەرا و ئەمریکادا گرین و ف.ه. برادلی و ج. روس لایەنگری فەلسەفەی روحی ئایینی راستڕەوی هێگڵیان دەکرد، بەڵام له روسیادا باڵی چەپی هێگڵ زاڵ بوو، ئەسکەندەر هوزن بەرچاوترین نوێنەری ئەم باڵەبوو له فەرەنسادا، له دوای فیکتۆر کوزان ئەم دوو باڵه له ململانێدا بوون، لەلایەن نوێنەری ئەم دوو باڵه وەکو رینان و فاشر و هاملان، له ئیتالیاشدا بندیتو کرۆچه فەیلەسووفی ئیتالی له هەوڵی ئەوەدا بوو رێبازێکی هێگڵێزمی نوێ دابمەزرێنێت که لایەنێکی هەڵبژاردەیی — إنتقائی — له هەر دوو باڵه چەپ و باڵه راستەکەدا هەبێت، کرۆچه هێڵه سەرەکییەکانی ئەو رێبازه نوێیەشی لەو کتێبەدا خستەڕوو (ئەوەی که زیندووەو ئەوەی که مردوو له فەلسەفەی هێگڵدا).

گۆته له بارەی هێگڵەوه گوتوویەتی: (هێگڵ ئایینی مەسیحی بۆ لای فەلسەفه رادەکێشێت، هەرچەنده ئەم ئایینه پەیوەندی به فەلسەفه نییە)، هەروەها جان





هیپولت له پێشەکی چاپی فەرەنسی (فەلسەفەی ماف) دا دەڵێت: کەسێك نکۆڵی لەوه ناکات که تەنگوچەڵەمەی تەفسیرکردنی فەلسەفەی هێگڵی بۆ ئەوه دەگەڕێنێتەوه، که زۆربەی ئەو بەرهەمانەی لەبەردەستماندایه بەرهەمی هەمه جۆرن، به پلەی یەکەم ئەو زنجیره لێکچەرانەی که قوتابییەکانی کۆیان کردۆتەوه که لێکۆڵەرەوەکان لەو لێکچەرانەدا جیاوازی لە نێوان ئەوه دەکەن که بیرێکی راستەقینەی مامۆستاکەیان بێت، لەگەڵ ئەوەی تەنیا گەیاندنێکی به ئامانەتی بیری ئەوه، بەڵام به شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، به پلەی دووەمیش ئەو بەرهەمه ئاڵۆزانەی که هێگڵ تەنیا ئاکامی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی خۆیمان بۆ کەشف ناکات، بەڵکو بنچینەی ئەنتۆلۆجی و لۆجیکی بیرکردنەوەی خۆیمان بۆ دەخاتەڕوو)[٣٢].

لەراستیدا هێگڵ زۆر بەسەر بەرهەمەکانی خۆیدا چوویتەوەو دەستکاری کردوون، لەبەر ئەوەشه هێگڵ له هەموو فەیلەسووف و بیرمەندێك زیاتر به دەقەکانی داچووەتەوەو دەستکاری کردوون، تا ئەو رادەیەی که رستەیەك له کتێبەکانی و هێلکارییەکانی نابینینەوه کەلێی نەکوژابێتەوەو بۆی زیاد نەکرابێت و ئاڵوگۆری تێدا نەکردبێت[٣٣].

تەمومژاویبوونی هەندێك دەستەواژەو رستەکانی ناو نوسینی هێگڵ، دواتر دەبێته سیمایەکی سەرەکی بەرچاوی ئەو فەیلەسوفانەی که لەدوای هێگڵدا دێنه کایەوه، له پێش هەمووشیانەوه نیتشه که زۆربەی نوسینەکانی تەمومژاوین.

له راستیدا نیتشه خالی وێکچونی له گەل هێگڵدا له وەدایه، که ئەویش وەکو هێگڵ باسی لەو هۆشیارییه مێژووییە کردووه له که لەهزری رۆژئاوادا له ئارادابووه، ئەم دوو بیرمەنده هەردووکیان بۆ ئەم مەبەسته دەگەڕێنەوه بۆ هزری یۆنانی. بەڵام خالی جیاواز له نێوان ئەم دوو بیرمەنده لەم بوارەدا له وەدایه، که هێگڵ به هەموو ئەو شتانه ڕازی دەبێت که له مێژووی هزری رۆژئاوادا باسیان لێوه دەکات، لەکاتێکدا نیتشه به پێچەوانەوه، رەخنەیان لێدەگرێت ورەتیان دەکاتەوه[٣٤].

کارل پۆپەر یەکێکە لەسەرسەختترین رەخنەگرانی هێگڵ لەو سەردەمەدا، پۆپەر لە کتێبەکەیدا (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی) ئەفلاتۆن و هێگڵ و مارکس بە دوژمنی راستەقینەی کۆمەڵگای کراوەو دادەنێت، پۆپەر لە دوا پەرەگرافی لەسەر هێگڵ لە کتێبەکەیدا ئەو قسەیەی شۆپنهاوەر دەهێنێتەوە کە دەربارەی هێگڵ گوتوویەتی کە دەڵێت: هێگڵ نەك هەر لەسەر فەلسەفە، بەڵکو لەسەر سەرتاپای ئەدەبیاتی ئەڵمانی کاریگەربووە، بەڵام کاریگەرییەکی وێرانکارانە، بەمانایەکی وردبینانەتر، کاریگەرییەکی سەرخۆشکەرانەی هەبووە، لەوانەیە بتواندرێت ئەوە بگوترێت کاریگەرییەکی تێکدەرانەی ئەخلاقی هەبووە، شەڕی سەخت و گیان فیداکارانە لەهەر ساتێك و هەر شوێنێك وەزیفەی کەسانێکەکە سەربەخۆیی راوبۆچوونیان هەیە، لەبەر ئەوە ئەگەر ئێمە بێ دەنگی بکەین بە پیشەی خۆمان، چ کەسێك قسە بکات؟ [٣٥]. کارل پۆپەر لەو روانگەیەوە ئەم قسەیەی شۆپنهاوەر دەهێنێتەوە، چونکە ئەو وای بۆ دەچێت کە هێگڵ فەیلەسووفی رەسمی دەوڵەت بوو، بەپێی بۆ چوونی پۆپەر ئەوانەی کە لەسەر رووی زەمین مزگێنی بەهەشت بە مرۆڤ دەدەن دۆزخ بۆ مرۆڤ دەخوڵقێنن، لەبەر ئەوە لای وایە هێگڵ شان بە شانی ئەفلاتۆن و مارکس دەبنە دوژمنی راستەقینەی کۆمەڵگای کراوە.

هەر لە فیکری هاوچەرخ (هێربرت مارکیوز) بە پێچەوانەی پۆپەر هێگڵ بە شۆڕشگێرترین فەیلەسووف دادەنێت کە لەسەردەمی خۆیدا توانیوتی سیفەتی شۆڕشگێرانە بە عەقڵ ببەخشێت لە کاتێکدا بە درێژایی مێژووی فەلسەفە عەقڵ مۆرکێکی خۆ پارێزانەی هەبووە، عەقڵ رەمزی نەگۆڕی و سەقامگیری و خۆ پارێزی بووە، کەچی لەسەر دەستی هێگڵ عەقڵ سیفەتێکی شۆڕگێرانەی خۆی بەدەست دەهێنێت [٣٦].

قسەکردن لەسەر فەلسەفەی هێگڵ زۆر لەمە زیاتر دەهێنێت، لەبەر ئەوەی هەر یەك لەلایەنەکانی فەلسەفەی هێگڵ بوارێکی فراوانی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە و باسکردن هەر لە فەلسەفەی روح و فەلسەفەی سروشت و فەلسەفەی مێژوو،





فەلسەفەی ماف و سیاسەت تا دەگاتە لۆجیك و ئیستاتیکا، باسکردنی ئەم لایەنانە پێویستی بە دەرفەتی زیاتر هەیە، ئەمە جگە لەوەی کە باسکردن لە میراتگرانی فەلسەفەی هێگڵ خۆی لە خۆیدا باسێکی بەرفرەوانە و قسە هەڵگرە، هەر وەك ئەنگلز دەڵێت: فینۆمینۆلۆجیای عەقڵ و لۆجیك و فەلسەفەی سروشت و فەلسەفەی عەقڵ کە ئەم لکانەی لێ دەبێتەوە: فەلسەفەی مێژوو، فەلسەفەی ئایین، مێژووی فەلسەفە، ئیستاتیکا و... هتد، لە هەموو ئەو بوارە مێژووییانەدا هێگڵ هەوڵ و کۆششێکی زۆری داوە تاوەکو هێڵی گەشەکردنێکی بەردەوام بدۆزێتەوە و بیخاتەروو، لەبەر ئەوەی کە هێگڵ خاوەنی زانیارییەکی ئینسکلۆپیدی بووە سەرەڕای ئەوەی کە بلیمەتێکی داهێنەربووە، لەبەر ئەوە لەسەرجەم ئەم بوارانەی سەرەوە رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە [٣٧].

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


١- د. عبدالرحمن بدوي ، حياة هيجل، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٨٠، ص ٧-٨.

٢- هيجل، العقل في التاريخ، محاضرات في فلسفة التاريخ، الجزء الاول –ترجمة و تقديم و تعليق د.امام عبدالفتاح امام، المكتبة الهيجلية، دار التنوير، بيروت، بدون سنة نشر، ص١٠-١١.

٣- هەمان سەرچاوەی، ل ١٢.

٤- ويل ديورانت، قصة الفلسفة، ترجمة: فتح الله محمد المشعشع، بيروت، بدون سنة نشر، ص٣٧٥.

٥- ولتر ستيس ، المنطق و فلسفة الطبيعة (فلسفة هيجل)، المجلد الاول، ترجمة د. امام عبد الفتاح امام، بيروت، ط٣، ١٩٨٣، ص١٦، امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، ص٥٠.

٦- د. عبدالرحمن بدوي ، حياة هيجل، مصدر سابق، ص١٣.

٧- هيجل ، العقل في التاريخ، مصدر سابق، ص١٣.

٨- احمد امين و زكي نجيب محمود ، قصة الفلسفة، الحديثة، في جزأين، القاهرة، ١٩٦٧، ص٢٣٦.

٩- ويل ديورانت ، قصة الفلسفة، مصدر سابق، ص٣٧٦.

١٠- د. زكريا ابراهيم ، هيجل او المثالية المطلقة، عبقريان فلسفية، القاهرة، بدون سنة نشر، ص٣٧.

١١- د. عبدالرحمن بدوي، حياة ه هيجل، مصدر سابق، ص٤١-٤٢.





١٢- د. عبدالرحمن بدوي، حياة هيجل، مصدر سابق، ص٤٨.

١٣- احمد امين و زكي نجيب محمود، قصة الفلسفة الحديثة، مصدر سابق، ص٢٣٦.

١٤- مەحەمەد کەمال، دیالیکتیکی زات وبابەت، لێکۆڵینەوەیەکەلە بەر ڕۆشنایی فەلسەفەکەی هێگڵ، گۆڤاری مامۆستای کورد، ، ژمارە٧، بەهاری ١٩٨٩، ل٢٤.

١٥- ولتر ستيس ، فلسفة الروح، المجلد الثاني، فلسفة هيجل، ، المكتبة الهيجيلة، امام عبد الفتاح امام، بيروت، ط٣، ١٩٨٧، ص ٦٦٥.

١٦- امام الفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، دار المعارف بمصر،بدون سنة نشر، ص١٠٥.

١٧- جان هيپوليت، دراسات في ماركس و هيجل، ترجمة جورج صدقني، دمشق، ١٩٧١، ص٥.

١٨- عبدالرحمن البدوي ،حياة هيجل، مصدر سابق، ص٥٨.

١٩- جورج طرابيشي، معجم الفلاسفة، بيروت، ١٩٨٧، ص٦٦٥.

٢٠- د. زكريا ابراهيم ،هيجل او المثالية المطلقة، مصدر سابق، ص٧٧.

٢١- د. عبدالرحمن بدوي ،حياة هيجل، مصدر سابق، ص٧٧.

٢٢- هيجل، موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، ترجمة د. امام عبدالفتاح امام، المكتبة الهيجلية ٦، بيروت، ١٩٨٣، ص٨.

٢٣- هەمان سەرچاوە، ل٢١١.

٢٤- هەمان سەرچاوە، ل٢٢٦.

٢٥- جورج طرابيشي، معجم الفلاسفة، مصدر سابق، ص٦٦٦.

٢٦- د. عبدالرحمن بدوي،حياة هيجل، مصدر سابق، ص٩٠.






٢٧- هيجل، موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، مصدر سابق، ص١٠.
٢٨- د. عبدالرحمن بدوي،حياة هيجل، مصدر سابق، ص ١٠٢.
٢٩- هەمان سەرچاوە، ل ١٠٥.
٣٠- هيجل ،العقل في التاريخ، مصدر سابق، ص١٨.
٣١- جورج طرابيشي، معجم الفلاسفة، مصدر سابق، ص ٦٦٥.
٣٢- هيجل، مبادئ فلسفة الحق، ترجمة تيسير شيخ العرب، دمشق، ١٩٧٤، ص٣.
٣٣- شارل مالك، المقدمة، الاثار العربية الكاملة، القسم الاول، المجلد الاول، بيروت، ١٩٧٧، ص ١٦٤.
**٣٤- عوسمان ياسین، فریدریك نیتشه، دەزگای چاپ وبلاْوكردنەوەی موكریانی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ٢٠٠٠، ص ١٠٧-١٠٨.**
٣٥ - كارل.ر. پوپر، جامعه باز و دشمنانش، ترجمه علی اصغر مهاجر، تهران، تابستان، چاپ سوم، ١٣٦٩، ص ٣١١.
٣٦- هربرت ماركيوز، العقل والثورة، ترجمة د. فواد زكريا، بيروت، الطبعة الثانية، ١٩٧٩، ص٦.
٣٧- فريدريك انجلس، التفسير الاشتراكي للتأريخ، دار الفارابي، بدون سنة نشر، ص ١٧.





## تەوەری دووەم

### سیستەمە هاوتەباكەی فەلسەفەی هێگڵ

هاوگونجانی وتەبایی یاخود هارمۆنییەتی بیركردنەوەی هەر بیرمەند و فەیلەسوفێك پەیوەستە بەو چوارچێوە گشتییەی بیركردنەوە كە بیرمەندەكە تێدا، پرۆسەی بیركردنەوەی خۆی ئەنجام دەدات. واتە لە سەرجەم ئەو بوارانەی كە بیرمەندەكە قسەی لەسەر دەكات، بۆچوونێكی گشتیگیری هێلە سەرەكییەكانی بیركردنەوەی بەڕێوەدەبات. لە مێژووی فەلسەفەدا زۆر فەیلەسوف هەن كە لەمیانەی تێڕوانینێكی گشتیگیری خۆیانەوە سەیری مەسەلەكان دەكەن، بەلاْم لەوانەیە دەگمەنن ئەو فەیلەسوفانەی كە بیركردنەوەكەیان وەكو دەزگایەی فەلسەفی بریتی بێت لە سیستەمێكی هاوتەبا و گونجاو.

سیستەمە فەلسەفییەكەی هێگڵ بە رادەیەك سیستەمێكی هاوتەبا و گونجاوە كە دەرهێنانی هەریەكەیەكی پێكهێنەری ئەو سیستەمە كەم و كوڕیی دەخاتە سەر سەرجەم سیستەمەكەوە.

جالێرەدا دەمانەوێت باسی فەلسەفەی هێگڵ بكەین بەو پێیەی كە دەزگا فەلسەفییەكەی هێگڵ یەكێك لەو دەزگا فەلسەفییە دەگمەنانەیە كە سیستەمێكی هاوتەبا و گونجاوی هەیە، ئەگەر بێت و سەیری فەلسەفەی هێگڵ بكەین، دەبینین لە بوارەكانی لۆجێك و شروست و عەقل و یاسا و ئاین و هونەر و مێژوو هتد...، هێلێكی هاوبەشی فەلسەفی هەموو ئەو بوارانە بە یەكتر دەبەستێتەوە، بە رادەیەك

كە سەیری هەریەك لەو بوارانە بكەین دەبینین چوارچێوەیەكی گشتی هەیە كە بوارەكانی دیكەش تێیدا دەخولێنەوە و لێی دەرناچن.

جا ئەگەر سەیری فەلسەفەی هێگڵ بكەین دەبینین لەم سێ بەشە پێكدێت:

یەكەم: لۆجێك یاخود زانستی بیرۆكەی گشتگیر لە خودی خۆی و بۆ خۆی.

دووەم: فەلسەفەی سروشت یاخود زانستی بیرۆكەی گشتگیر لە دەرەوەی خوێدا، واتە لە ئەویتر —الآخر- other.

سێیەم: فەلسەفەی روح یاخود زانستی بیرۆكەی گشتگیر كە لە دەرەوەی خۆیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەوەی خۆی.

جا ئەم سێ بەشەی فەلسەفەی هێگڵ تەنیا لە یەك بابەت دەكۆڵنەوە، كە ئەویش بیرۆكەی گشتگیرە Begriff لەو قۆناغە جیاجیایانەی كە پێدا تێدەپەڕێت[١].

كەواتە هەر سێ بەشەكەی فەلسەفەی هێگڵ لە جۆرەكانی عەقل دەكوڵنەوە، چونكە بیرۆكەی گشتگیر هاو واتای عەقڵە. جۆرەكانی عەقلیش لە فەلسەفەی هێگڵدا بەم شێوانەن:

- عەقلی پەتی لە لۆجێك.
- عەقل لە حاڵەتی دەرچوون بۆ دەرەوەی خۆی لە فەلسەفەی سروشت.
- عەقڵ كاتێك دەگەڕێتەوە ناوەوەی خۆی لە فەلسەفەی روحدا.

ئەم وشانە : روح و عەقڵ و بیرۆكەی گشتگیر یاخود بیرۆكەی رەها لە فەلسەفەی هێگڵدا بە یەك مانا بەكاردەهێندرێن، جا ئەگەر وشەی روح بە ئەڵمانی Geist پێی بگوترێت، بە ئینگلیزیش هەردوو وشەی Spirit و Mind بۆ بەكاربهێندرێت، بەڵام (والترستیس) لە كتێبەكەیدا لەسەر فەلسەفەی روحی هێگڵدا وشەی (Spirit) بەشێوەیەكی گشتی و بە سیفەتێكی گشتی بەكاردەهێنێت، وە زۆرجاریش هەروەكو خۆی دەڵێت لەوانەیە بەكارهێنانی Mindیش سوودبەخش بێت[٢].

لۆجیك لە فەلسەفەی هێگڵدا بریتییە لە دیالیكتیك، چونكە هەروەك هێگڵ خۆی لە پێشەكی كتێبی (لۆجێكی گەورەدا) دەڵێت: (پێشتر واسەیری دیالیكتیك



دەكرا كە بەشێكی جیاكراوەیە لە لۆجێك، لە راستیدا ئەوان بە هەڵە لەو مەسەلەیە گەیشتبوون، بەڵام ئێمە بەشێوەیەكی تەواو جیاواز لەوان ( لە پێشتر) باس لە لۆجیك دەكەین)[٣].

دیالیكتیك بەو سیستەمە ناسراوە، كە بێ ترس لە ئاستی ناكۆكییەكاندا رادەوەستێت و تەفسیری واقیعێكی دینامیكی دەكات، دینامیكییەتی واقعیش لەسەر سیستەمی دیالیكتیكی، پێڕەوی جووڵان و گۆڕانكاریی سێكوچكەیی (Triad) دەكات، ئەم گۆڕانكارییەش لە بابەتەوە Thesis بۆ دژە بابەت Antithesis دەڕوات.

بابەت و دژە بابەتیش لە ناكۆكییەكانی نێوانیان لە ئەنجامی زۆرانبازی یەكتردا قۆناغێكی نوێتر- تێهەڵكێش Sysnthesis دەهێننەكایەوە، دژە بابەت لەناو منداڵدانی بابەتدا لە دایك دەبێت و بەشێكە لەو، وەكو دژی بابەتەكەش جودایە و خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە، بابەت و دژە بابەت لە قۆناغی سێیەمدا، كە ناومان نا تێهەڵكێش یەكدەگرنەوە و قۆناغێك دەوڵەمەندتر و پێشكەوتووتر دەخوڵقێنن، ئەم گۆڕانكارییە دیالیكتیكییەش هەمیشەییە و بەردەوامە[٤].

كەواتە سێكوچكەی تێیز و ئەنتی تێز و سەنتێز جووڵە و بەردەوامی دیالیكتیك پێكدەهێنن، هەرچەندە لە پێش هێگڵدا فەیلەسوفانی دیكەش باسیان لەو مەسەلەیە كردووە، بەڵام لەلای هێگڵدا ئەم وتەزایانە (المقولات) لە بواری پەرەسەندن یاخود گۆڕانكاری نائاسایی عەقڵ پەیڕەودەكرێن، عەقڵ لە خودی خۆیدا و عەقڵ لە دەرەوەی خۆی و دواجار عەقڵ دەگەڕێتەوە ناوەوەی خۆی.

دەكرێت گرنگترین جیاوازی هێگڵ لەم بوارەدا لەگەڵ فەیلەسوفەكان پێش خۆی لە پێش هەموویانەوە لەگەڵ (فیختە)دا لەوە دابێت، كە میتۆدەكەی فیختە ناوی لێ دەنێت میتۆی ناكۆكییەكان، بەڵام لەلای هێگڵ ئەو میتۆدە دەبێتە میتۆدی دیالیكتیكی، ئەمە جگە لەوەی كە لای هێگڵ هەموو پرنسیپ و وتەزایەك دەبێت





بسەلمێندرێت، ئەمە لە کاتێکدا لای فیختە پرنسیپەکان شتی بەدیهین و پێویست بە سەلماندن ناکات[٥].

ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر عەقڵ دادێن چوارچێوەیەکی گشتییە کە خودی لۆجیکی دیالیکتیکی و فەلسەفەی مێژوو، هەروەها فەلسەفەی یاسای هێگڵ پێکدەهێنن، کە هەر هەموو ئەو فەلسەفانە بە فەلسەفەی هونەر و فەلسەفەی ئاین و فەلسەفەی سروشتییەوە هەر هەموویان فەلسەفەی روح یاخود فەلسەفەی عەقڵی هێگڵ پیکدەهێنن، کە خۆی لە خۆیدا بیرۆکەیەکی گشتگیرە و هەموو مەسەلەکان بە خۆوە دەگرێت، هەر سێ قۆناغەکەی عەقڵ یاخود روح، روحی خودی، روحی بابەتی و روحی رەها، سەرجەم بوارە جیاجیاکانی فەلسەفەی هێگڵ بەشێوەیەکی هاوتەبا و گونجاو بەڕێوەدەبەن.

جا ئەگەر روحی خودی قۆناغی یەکەمی روح بێت، بەو پێیەی کە عەقڵێکی مرۆڤایەتییە و لە خودێکدا، واتە سەیرکردنی روح لە ناوەوەی خۆی، لە عەقڵی تاکە کەسێکدا، کە لە چەندان بەش پێکهاتووە، وەکو دەرککردن یاخود هەستکردن، ئارەزوو، تێگەیشتن، خەیاڵ، یادەوەری .... هتد. جادەکرێت بڵێین ئەو بەشەی روح بابەتی سایکۆلۆجیایە، روحی بابەتیش، کە ئەو عەقڵەیە دەچێتە دەرەوەی خۆی، ئەویش لە قۆناغی دووەمی پەرەسەندنە دیالیکتیکانەکەی روحدا، ئەو روحە بابەتیەش دەبێتە بابەتی فەلسەفەی یاسا و فەلسەفەی سیاسەت.

روح لەدوا قۆناغی گەشەکردنیدا دەچێتە قۆناغی رەهاو، کە روح ئەو کاتە دەگەڕێتەوە ناوەوەی خۆی، ئەو روحەش بابەتی ئاین و هونەرە جوانەکانە، یاخود بە واتایەکی دیکە و روونتر بڵێین لە روحی رەهادا عەقڵ ئازادی تەواوی خۆی بەدەست دەهێنیتەوە و ئەو حاڵەتەش لە ئاین و هونەرە جوانەکاندا تەعبیری لێدەکرێت، فەلسەفەی مێژووش باس لەو گۆڕانکارییانەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکات کە دیالیکتیکییانە هەر سێ قۆناغەکەی روحی تێدا بەرجەستە دەبێت.





جا ئەگەر بێت و بەدیدێکی گشتگیرییانە یاخود بە دیوێکی دیکەوە سەیری فەلسەفەی هێگڵ بکەین، ئەوا دەکرێت بڵێین ئەو هاوگونجانەی لە سیستەمە فەلسەفییەکەی هێگڵدا بەدی دەکرێت، خۆی لەو یەکێتییەی نێوان ئەنتۆلۆجیا (زانستی بوون- علم الوجود) و لۆجێك و ئەبستمۆلۆجیا (المعرفە) دەدۆزێتەوە.

چونکە ئەگەر بێت و سەیری ئەنتۆلۆجیای هێگڵی بکەین، دەبینین زۆر لەو ئەنتۆلۆجیایانەی فەیلەسوفانەی پێش هێگڵ باسی لێوەدەکەن جیاوازی هەیە، هەروەها دەکرێت هەمان قسە لەبارەی لۆجیك و مەعریفەشەوە بکەین.

لای هێگڵ ئەنتۆلۆجیا و مەعریفە و لۆجیك خاوەن ناسنامەیەکی هاوبەشن، لەبەر ئەوە هێگڵ دژی هەر بۆچوونێك دەوەستێت کە کەلێنێك بخاتە نێوان ئەو سێ کایەوە، لەبەر ئەوەشە رەخنەیەکی قووڵ لەو ناکۆکییە میتافیزیقییانە نێوان ئەم سێ کایە دەگرێت، جا لەبەر ئەوە لە فەلسەفەی هێگڵدا ناکرێت نەسقێکی و تەزاکانی ئەنتۆلۆجیا جیاواز لە نەسقێکی وتەزاکانی لۆجیك و مەعریفە بەدی بکرێت، واتە بەپێی فەلسەفەی هێگڵ مەحاڵە بتواندرێت جیاوازییەك لە نەسقی وتەزاکانی ئەنتۆلۆجیا و لۆجیك و مەعریفەدا بەدی بکرێت.

ئا لێرەشدا هێگڵ هەوڵیداوە ئەو کەلێنەی دەکەوێتە نێوان جیهانی بابەتی و یاساکانی فیکر نەهێلێت و ئەو کەلێنەی کە باسی لێوەدەکرێت رەتبکاتەوە، یاخود پوچەل یبکاتەوە[٦].

هەر بەم شێوەیەش دەبینین بۆچوونەکانی هێگڵ سەبارەت بە ئەنتۆلۆجیا و لۆجیك و مەعریفە سەرتاپا جیاوازییان هەیە لەگەڵ بۆچوونەکانی پێش خۆی، هێگڵ لەمیانەی کارە فەلسەفییەکانی خۆیدا هەوڵیداوە جۆرە پەیوەندییەکی هارمۆنی و تەباییانە لەم سێ بوارەدا بخاتەڕوو، ئەمەش وایکردووە کە ببێتە خاوەن سیستەمێکی هاوتەبایی فەلسەفی، کە تێیدا ئەنتۆلۆجیا و لۆجیك و مەعریفە لە هاوتەباییەکی بەردەوامدان، پرۆسەی بەردەوامییەکەش کردارێکی دیالیکتیکییانە بەڕێوەی دەبات، کە خودی میتۆدی هێگڵ پێکدەهێنت.

## پەراوێزەکان

١- امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، دار المعارف بمصر، ص ٢٢.

٢- ولتر ستيس، فلسفة هيجل ،المجلد الثانی، فلسفة الروح، ترجمة د. امام عبدالفتاح امام، دار التنوير بيروت، الطبعة الثالثة ، ١٩٨٣، ص ٧.

٣- امام عبدالفتاح امام ، المنهج الجدلى عند هيجل، مصدر سابق، ص ١٩.

٤- د. مەحەمەد کەمال، فەلسەفەی هێگڵ، دەزگای سەردەم سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٣٠٠.

٥- امام عبدالفتاح امام ، المنهج الجدلى عند هيجل، مصدر سابق، ص ٨٨.

٦- هربرت ماركيوز، نظرية الوجود عند هيجل، ترجمة: ابراهيم فتحي، دار التنوير، بيروت الطبعة الاولى، ١٩٨٤، ص ٥.



# تەوەری سێیەم

## دەوڵەت لە فەلسەفەی هێگڵدا

### دەستپێك

بیرکردنەوە سەبارەت بە دەوڵەت شوێنێکی بەرچاوی هەیە لە مێژووی بیری فەلسەفیدا، بەتایبەتی لە بیری فەلسەفەی ئەڵمانیدا، جۆرج ڤلهلم فریدرش هێگڵ بەرچاوترین فەیلەسوفی ئەڵمانییە کە خاوەنی بیرکردنەوەی تایبەتی خۆیەتی لەمەڕ دەوڵەتدا. ئەم فەیلەسوفە لە میانەی چوارچێوەیەکی گشتی فەلسەفەیەکدا کە بریتییە لە پرۆسەی گەشەکردنی دیالیکتیکییانەی عەقڵ باس لە چەمکی دەوڵەت دەکات.

لەم تەوەریەدا هەوڵدەدەین لە دوو بەندا تێروانینە گشتییەکانی فەلسەفەی هێگڵ بۆ یاساو دەوڵەت بخەینە ڕوو، لە بەندی یەکەمدا، باس لە فەلسەفەی یاساو فەلسەفەی سیاسەت و عەقلی بابەتی دەکەین، لە بەندی دووەمدا باس لە ماهییەتی عەقل و دەوڵەت دەکەین، لە کۆتایشدا ئاکامی باسەکەمان لەم تەوەریەدا لە چەند خاڵێکدا چڕ دەکەینەوە.





## بەندی یەکەم
## فەلسەفەی یاسا و فەلسەفەی سیاسی و عەقڵی بابەتی

پێدەچێت هێگڵ زۆر گرنگی بە بواری سیاسەت دابێت، بەپێچەوانەی هەندێك لە فەیلەسوفانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی، کە زیاتر سەرقاڵی تیۆرانینی گۆشەگیرانە بوونە، جا لەبەر ئەوە گرنگی دانی هێگڵ بە یاساو سیاسەت و دەوڵەت وای لە هەندێ نوسەر کردووە، کە بڵێن هێگڵ خەونی بەوە دەبینی ببێتە میکاڤیلی سەردەمی خۆی[1].

لە ڕاستیدا زۆر هۆکار لە ئارادابوون بۆ ئەوەی هێگڵ ڕاکێشنە ناو بواری سیاسەتەوە، سەرەڕای بنەماڵەکەی و پەروەردەکردنی و ئەو ڕۆشنبیرییەی کە هەیبوو، لە ڕۆژگاری هێگڵ دا چەندین ڕووداوی سیاسی گرنگ و کاریگەر ڕوویان دا، لەپێش هەموویانەوە شۆڕشی بورجوازی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٨٩ ، هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی کە ئەم شۆڕشە لەگەڵ خۆیدا لە فەرەنسا و ئەوروپا و جیهاندا هێنایەکایەوە، ئەو کاتەی کە پاستیل ڕووخا هێگڵ تەمەنی نۆزدە ساڵ بوو، کاتێك شەڕی واترلۆ ڕوی دا تەمەنی گەیشتبووە چل و پێنج ساڵ ..بەم جۆرە ئەو بیرمەندە وەکو شاهێدێك وابوو لە سەردەمی خۆیدا لەلاچوونی سیستەمی سیاسی کۆن و هاتنەکایەی سیستەمە نوێیەکان .

هێگڵ تەنیا وەکو چاودێرێك سەیری ڕووداوە سیاسییەکانی سەردەمی خۆی نەدەکردو هەر تەنیا بەوە نەدەوەستا کە شییان بکاتەوە ، بەڵکو بەدوای ڕەگ و ڕیشە فەلسەفییەکانی سیاسەت دا دەگەڕا، جا لەم بارەیەوە لێکچەرەکانی خۆی لە زانکۆکانی یینا وپاشان هایدلبرج و دواتریش زانکۆی بەرلین دەگوتەوە ، ئەوە بوو کتێبی (بنەماکانی فەلسەفەی ماف ) ی نووسی تاکو وەکو ڕێبەرێك وابێت بۆ قوتابیەکانی لەو زانکۆیانەی کە لێکچەرەکانی تێدا دەگوتەوە ، هەروەها لەو



کتێبەیدا بەشێوەیەکی فراوانتر باس لەو مەسەلانە دەکات کە پێشتر بە شێوەیەکی ڕاگوزەر لە کتێبی ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفیەکاندا باسی لێوە کردبوون.

هەرچەندە هێگڵ زۆر وتار و لێکۆڵینەوەی سیاسییانەی لە قۆناغێکی زووی ژیانییەوە نووسیبوون ، بەلاّم گرنگترین نووسینێك لەم بوارەدا کتێبی بنەماکانی فەلسەفەی مافە، یاخود کورتەیەك لە زانستی سیاسەت و یاسای نێودەوڵەتی[2] .

هێگڵ لە کتێبی (بنەماکانی فەلسەفەی ماف) دا سەرجەم بۆچوونەکانی خۆی لە بواری فەلسەفەی یاساو ماف و دەوڵەت و خێزان و کۆمەڵگەی مەدەنیدا خستۆتە ڕوو، ئەم کتێبەی وەکو ڕێنیشاندەرە بۆ ئەو لێکچەرانەی لە بواری (فەلسەفەی ماف) کە بەپێی وەزیفەکەی خۆی کە پرۆفیسۆری فەلسەفە بووە لە زانکۆی بەرلین گوتویەتییەوە، واتە ئەو لێکچەرانەی لە وەرزی زستاندا بۆ خوێندنی یەك وەرزی بە قوتابیەکانی گوتۆتەوە[3].

ئەم کتێبەی هێگڵ زیاتر لە هەموو نووسینەکانی دیکەی کەوتۆتە بەر ڕەخنە لێگرتن و هەروەها قسەو باس و گفتوگۆکردنێکی زۆری دروست کرد. ب.بوزانکیت لەو بارەیەوە دەنوسێت: (لەوانەیە ئەو کتێبە زیاتر لە هەر کتێبێکی دیکەی فەیلەسوفانی مەزنی بواری سیاسەت تووشی بەهەڵە لێ تێگەیشتن بووبێت، جگە لە کتێبی کۆماری ئەفلاتۆن کە تووشی هەمان بە هەڵە لێ تێگەیشتن هاتووە).

بوزانکیت دەست نیشانی دوو هۆکاری سەرەکی دەکات،کە بوونەتە هۆی ئەوەی زیاتر لە هۆکارەکانی دیکە بەهەڵە لەو کتێبە بگەن، هۆکاری یەکەمیان ئەو بارودۆخە سیاسییە ئاڵۆزە بووە کە ئەڵمانیای ئەو کات پێی تێدەپەڕی، کە کتێبەکەی تێدا نووسرابوو، ئەمەش وای کرد لێکدانەوەی هەڵەی بۆ بکرێت، هۆکاری دووەم ئەو گرفتانەیە کە تووشی هەر لێکدانەوە و شیکردنەوەیەکی فەلسەفییانەی کۆمەڵگە دەبێت[4].

هێگڵ لە کتێبی( فینۆ مینۆلۆجیای ڕوح)دا باس لەو پرۆسە دیالیکتیکیانە دەکات کە بەسەر ڕوح دا دێت، لە ڕوحی خودییەوە بۆ ڕوحی تایبەتی و پاشانیش

روحی ڕەها، واتا لەو کاتەی روح لە خودی خۆی دایەو دوای ئەوەی دەچێتە دەرەوەی خۆی لە بابەتی دەرەوەی خۆی دا بەرجەستە دەبێت، ئینجا پاشان دوای پەرەسەندنێکی دیالیکتیکیانەی دوور و قووڵ دەگەڕێتەوە ناوەوەی خۆی و بەپلەی ڕەها دەگات، جا ئەگەر ئەم گەشتەی روح لە کتێبی (فینۆمینۆلۆجیای روح)دا هێگڵ باسی لێوە کردبێت[٥] ، ئەوا هێگڵ لەکتێبی (بنەماکانی فەلسەفەی ماف)دا، هەر تەنیا باس لە روحی بابەتی دەکات، ئەو روحەی کە لە بابەتەکانی دەرەوەی خۆی بەرجەستە دەبێت.

لێرەدا دەتوانین بڵێین کە فەلسەفەی یاسا لەلایەن هێگڵەوە خۆی لە روحی بابەتی یاخود عەقڵی بابەتی دەدۆزێتەوە، عەقڵی بابەتی ئەو ڕووبەرە فراوانەیە لای هێگڵ کە دەکرێت فەلسەفەی یاسایی بەنێودا بخولێتەوە، ئەو کاتەی کە عەقڵ دەچێتە دەرەوەی خۆی ئەو کاتە کاری فەلسەفەی یاسا دەست پێ دەکات.

## عەقڵی بابەتی یاخود روحی بابەتی

جا ئەگەر عەقڵی خودی (العقل الذاتي) ئەو عەقڵە بێت کە لە خودی تاکەکاندا بەدی بکرێت و بابەتێك بێت بۆ دەروونزانی –سایکۆلۆجیا- کە گرنگترین شێوازەکانی ئەو بابەتە بریتین لە: ئارەزوو، ویژدان،ویستەکان، هەروەها تێگەیشتن و چالاکی و رەفتارەکانی مرۆڤ. بۆیە کە ئەو عەقڵە خودییە بەوە دەهێنرێتە بەرچاو کە عەقڵێکە و لە ناوەوە سەیر دەکرێت، چونکە لە چوارچێوەیەکی ناوەکی خۆیەوە دەخولێتەوە و هێشتاکە پەلوپۆی نەهاوێشتووە بۆ دەرەوەی خۆی ، تاوەکو لە شێوەی دیکە دەربکەوێت، کە دەکرێت پێی بگوترێت شێوەی عەقڵی دەرەکی، لەم شێوەیەی دواییاندا عەقڵ دەکرێت لە دەرەوە سەیر بکرێت، چونکە شێوازەکانی ئەو عەقڵە دەتوانێت لە دەرەوەی عەقڵەکە خۆی بنوێنی، گرنگترین شێوازەکانیشی لەو





دەستە و ئەنستیتۆیە رێکخراوانە دەردەکەوێت ، کە دەکرێت پێیان بگوترێت یاسا، دابونەریت، ئەخلاق، رێکخراوی سیاسی..هتد.

بنەماکانی روحی بابەتی بریتین لە: چالاکییەکانی ئیرادە، دامەزراوە و رێکخراوەکان کە دەرئەنجامی کارەکانی ئیرادەن، لەو کاتەی کە کارەکانی ئیرادە یاخود چالاکییەکانی ئیرادە لە جیهاندا خۆیان دەنوێنن، یاخود بەدەردەکەون وەکو کەرستەیەکی خاو وەردەچەرخێن بۆجیهانێکی دیکەی نوێی عەقڵ.

یەکێك لە رووە سەرەکییەکانی ئەو چالاکییەکانەی ئیرادە ئەوەیە هەمیشە دەیەوێت لە خودی خۆیدا تێپەڕێنێت و بەرەو گشتگیری بچێت کە جەوهەری خۆیەتی، جا لەبەر ئەمە ئەو جیهانە نوێیەی کە دروستی کردووە هەر تەنیا جیهانێکی بابەتی نییە، بەڵکو جیهانێکی روحیشە، روحییەکی بابەتی، لەو کاتەی ئیرادە بەدوای گشتگیریدا وێڵە، بەدوای خودی خۆشی دا دەگەڕێت، کەواتە لە یەك کاتدا خودێکی گشتگیری یە، لەبەر ئەوەیە ئەو جیهانە نوێیەی دروست کراوە یاخود هاتۆتە کایەوە هەر تەنیا لایەنێکی بابەتی نییە، بەڵکو بابەتێکی روحیشی هەیە کە ئەویش روحی بابەتییە [٦].

هێگڵ لە کتێبی بنەماکانی فەلسەفەی مافدا کە باس لە روحی بابەتی دەکات، ئەوە دەخاتە روو کە پێکهاتەی ئەم روحە بابەتییەش سێ پێکهاتەی دیکەی هەیە، کە بریتین لە مافی پەتی (الحق المجرد Absrtact Riagh) و (ئەخلاقییەتی تاکەکەس-Morality ) و (ئەخلاقییەتی کۆمەڵایەتی- Social Ethice)، ئیتر ئەم سێ پێکهاتەیەش هەریەکەیان سێ پێکهاتەی دیکەیان هەیە، بەم شێوەیە هەست دەکەین ئەو پەیوەندییە دیالیکتیکییەی لۆجیکی دەزگا فەلسەفییەکەی هێگڵ وەك پرۆسەیەکی بەردەوام لە ئارادایە و تەعبیر لە یەکەیەکی گونجاو و گشتگیری عەقڵ و بیرکردنەوەوی جیهان دەکات، وەکو کۆشك و تەلارێکی فەلسەفی دەتوانین سەیری فەلسەفەکەی هێگڵ بکەین کە هەر یەك لەو بەشانەی کە بەشەکانی دیکەی لێ پێك دێت یاخود بەشەکانی دیکە پێك دەهێنن, جوانکارییەکی

فەلسەفییانە دەبەخشن، کە بەو هەماهەنگی و پێکهاتە ئەندازییانە بەدی دەکرێت.

ئەو پەرەسەندنانەی روح لە خودی خۆی بۆ دەرەوەی خۆی پاشان گەڕانەوەی بۆ خودی خۆی لە هەریەك لە پێکهاتەکانی روحی بابەتی بە شێوەیەك لە شێوەکانی ئەم پرۆسەیە ڕوودەدات و لۆجێکی دیالیکتیکیانەی خۆی دەنوێنێت.

جا ئە گەر روحی بابەتی بەرجەستە بوونی روح بێت لە دەرەوەی خۆیدا و لە دامەزراوەو دام و دەزگا کۆمەلآیەتی و سیاسییەکاندا خۆی بنوێنێت، ئەو کاتە روحی بابەتی هەر تەنیا بابەتی فەلسەفەی یاسا نییە، بەڵکو روحی بابەتی دەبێتە رووبەرێکی فراوان کە سەرجەم زانستە کۆمەلآیەتیەکان و سیاسیەکانیش دەتوانن لێکۆڵینەوەکانیان تێدا ئەنجام بدەن ، ئەمە جگە لەوەی کە مێژووی پەرەسەندنی کۆمەڵگا و پرۆسەی سیاسییانە لەو قۆناغەی روحدا بەدی دەکرێن، کە روح دەبێتە بابەتێك و سەرجەم دامەزراوە مرۆییەکان بەخۆوە دەگرێت [٧].

بە پێی بیرکردنەوەی دیالیکتیکیانەی هێگڵ دەوڵەت دوا قۆناغی پەرەسەندنی روحی بابەتییە، چونکە روحی بابەتی دوای ئەوەی لە خۆی جیا دەبێتەوە و لە مافی پەتی (الحق المجرد) و ئەخلاقییەتی تاکی خۆی دەدۆزێتەوە لە ئەخلاقییەتی کۆمەڵایەتی، لە میانەی سەرهەڵدانی لەناو خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی گەشە دەکات، تاوەکو دەگاتە لوتکەی پەرەسەندنەکەی کە دەوڵەتە، ئەو کاتە هەمدیس روح دەگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی، ئەو کاتە روح دەگاتە ئەو پلە گشتگیرییەی کە تەعبیر لە بوون دەکات.






## بەندی دووەم

## ماهییەتی عەقڵ و دەوڵەت

هێگڵ لە میانەی هەوڵ و کۆششەکانی بۆ داڕشتنی وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرا و تەواو بۆ دەوڵەت ڕێرەوێکی پێچەوانەی فەیلەسوفەکانی سەدەی هەژدەم و ئەو بیرمەندانەی کە دەستوورەکانی شۆڕشی فەرەنسییان دامەزراند، (بە تایبەتی سیس- Sieyes) ی گرتە بەر، ئەو فەیلەسوف و بیرمەندانەی ئەو کات زۆر هەوڵیان دەدا کە وێنەی دەوڵەتێکی نموونەیی دروست بکەن، بەلاّم هێگڵ وای بۆ دەچوو کە ئەوەی هەیەو لە ئارادایە، داهێنراوێکی مێژوویی و فیکرەو لە هەر بوونێکدا هەمیشە عەقڵ هەیە هەر وەك ئازادیش هەیە[١].

هێگڵ سەبارەت بەو بۆچوونانەی پێش خۆی یاخود ئەو بیروبۆچوونانەی لە سەردەمی خۆیدا سەبارەت بە دەوڵەت لە ئارادا بوون ڕەخنەی گرتووەو ئەو بۆچوونانەی بە ڕووکەش لە قەڵەم داون، هێگڵ لەم بارەیەوە وەکو ڕابەری ئەو بۆچوونە ڕووکەشانە باس لە( هێر فریز **Herr Fries** ) دەکات، کاتێك ئەو بیرمەندە لە کۆبونەوە ئاهەنگسازییەکانی مارتبرج لە کۆمەڵەی قوتابیانی ئەڵمانی لە ١٨ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٨١٧ سازیان داوە، هەر وەك هێگڵ دەڵێت: فریز بێشەرمانە لەو بۆنە ئاهەنگسازییە جەماوەرییەدا ئەو بۆچونەی خۆی دەربارەی دەوڵەت و دەستوور دەخاتە ڕوو کە دەڵێت: دەبێت هەموو وەزیفەیەك لە وەزیفە گشتییەکاندا، لەو گەلەی کە روحێکی هاوبەشی ڕەسەنی تێدا باوە ، زیندوویەتیان لەو بنکەیە واتا لەو گەلە وەر بگرن ، ئەوا دەبێت هەر پرۆژەیەکی تایبەت بە ڕۆشنبیریکردنی گەل، یاخود بۆ بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵێکی زیندوو تەرخان بکرێت، کە خۆیان ببەخشن بۆ ئەم کارەو و لەگەڵ یەکتردا بە ڕادەیەك یەکگرتووبن

به زنجیرەیەکی دۆستایەتی پیرۆز بەیەکتری ببەسترێنەوەو نەکرێت لە یەکتر جیا ببنەوە[٢] .

هێگڵ دەربارەی ئەم بۆ چوونەی فریز وای بۆ دەچێت کە ئەمە جۆرە بیرکردنەوەیەکی ڕووکەشانەیە کە لە سەر بنەمای پەرەسەندنی بیرو بیرۆکەی هەمەلایەن یاخود گشتگیری زانستی فەلسەفی بنیاد نەنراوە، بەڵکو پشت بە دەرککردنێکی هەستی ڕاستەوخۆ و گەمەی خەیاڵێکی کاتی دەبەستێت.

تێڕوانینێکی ڕووکەشانە بۆ دەوڵەت، ئەو تێڕوانینە ڕووکەشانەیە کە ناتوانێ قووڵبێتەوە لە بوونی ڕاستەقینەی دەوڵەت کە لە ئاکامی پرۆسەیەکی دیالیکتیکانەی پەرەسەندنی عەقڵ دا دێتەکایەوە . ئەو پرۆسەیەی عەقڵ کە بریتییە لە گەڕانی عەقڵ بە دوای ماهییەتی خۆیدا کە ئازادی یە، دواجار لە دەوڵەت دا بەو ماهییەتەی خۆی دەگات، جا ئەگەر عەقڵ یان روح لە میانەی پرۆسەی دیالیکتیکانەی خۆیدا بەسێ قۆناغ تێدەپەڕێ، هۆشیاری خودی و هۆشیاری بابەتی و هوشیاری ڕەها، یاخود روحی خودیو روحی بابەتی و روحی ڕەها، ئەوە هەر یەك لەو قۆناغانەش دیارە پرۆسەی دیالیکتیکانەی تایبەت بە خۆیان هەیە، دەوڵەتیش کە دوا بابەتی یاخود دوا ئاکامی پەرەسەندنی روحی بابەتییە، لەو قۆناغەدا روح یاخود عەقڵ بە ڕەهای خۆی دەگات، واتا دەوڵەت گەیشتنی عەقڵە بە ڕەهای خۆی لە چوارچێوەی عەقڵی بابەتییەوە نەك لە چوارچێوە گشتییەکەی عەقڵ، کە لە ئاین و هونەر و فەلسەفەدا بەڕەهای خۆی دەگات.

دیارە عەقڵی بابەتیش لە چەندین قۆناغ پێکدێت، مافی پەتی و ئەخلاقییەتی تاکەکەس و ئەخلاقییەتی کۆمەڵایەتی، کە سێیەم قۆناغی عەقڵی بابەتی یە، یاخود دەکرێ بڵێین دوا قۆناغی عەقڵی بابەتییە، کە تێیدا دەوڵەت دێتە کایەوە، ئەخلاقییەتی کۆمەڵایەتیش پێکهاتەی خۆی هەیە، ڕەگەزە پێکهاتەکانی بیری گشتگیری لە ئەخلاقییەتی کۆمەڵایەتیدا هەمان ئەو سێ کوچکەیە، کە فەلسەفە دیالیکتیکیەکەی هێگڵ بەڕێوەدەبەن .



گشتگیری و پاژەکی (الجزئي) و تاکە کەسی، ئەمانە سێ قۆناغن لە ئەخلاقییەتی کۆمەڵایەتیدا کە لە میانەی پرۆسەی پەرەسەندنی عەقڵدا لەناو دامەزراوە دەرەکییەکان خۆیان دەنوێنن، جا ئەگەر پێکهاتەکانی ئەخلاقییەتی کۆمەڵایەتی بریتیبن لە خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت، ئەوا کرۆکی پێکهاتەی خێزان گشتگیری یە، کە تێیدا هەموو تاکەکان لەناویدا دەتوێنەوە وگشتگیری خێزانەکە پێك دەهێنن، دواتر لەمیانەی پەیوەندی نێوان دایك و باوك لەلایەك و منداڵەکانیان لەلایەکی دیکەوە بەهۆی ڕوودانی ناکۆکییەکان لە نێوانیان دا تەقینەوەی ئارەزووە تاکییەکان وەدەرچوون لەو گشتگیری یە ڕوو دەدات و خێزان لێك دەترازێت و هەڵدەوەشێتەوە و کۆمەڵگای مەدەنی دێتە کایەوە، کۆمەڵگای مەدەنیش تەعبیر لەو ساتە پاژەکییە (لحظة الجزئية) دەکات کە تاکەکان تێدا بەدوای ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان دەگەڕێن.

لە ئەنجامی هەڵوەشانەوەی خێزانی کۆن و هاتنەکایەوەی چەندان خێزانی نوێ کۆمەڵگای مەدەنی وەکو پێویستییەك بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو خێزانە نوێیانە دێتە کایەوە، کۆمەڵگای مەدەنی کە سێ پێکهاتەی هەیە، سیستەمی پێویستییەکان و دەستەی دادوەری و پۆلیس و سەندیکاکان، دەبینین ئەم سێ پێکهاتانە کە زۆر پێویستن بۆ دەوڵەت، لەقۆناغی کۆمەڵگای مەدەنی دا هەن.

لە ڕاستیدا لای هێگڵ کۆمەڵگای مەدەنی لایەنی پەتی (الجانب المجرد) دەوڵەتە، واتا هەرچەندە کۆمەڵگای مەدەنی جیایە لە دەوڵەت، بەلاّم لەگەڵ ئەوەش دا بوونیان پەیوەستە بەیەکترەوە، بەلاّم جیاوازی جەوهەری نێوانیان ئەوەیە کە تاك لە کۆمەڵگای مەدەنی وا سەیری خۆی دەکات کە خۆی تاکە ئامانجە، واتا ئامانج لە کۆمەڵگای مەدەنی دا پاژەکییە (الجزئية)، بەلاّم لە دەوڵەتدا ئامانجێکی بالاّتر لە ئامانجی تاك لە ئارادایە و تاکەکان بۆی تێدەکۆشن کە ئامانجێکی گشتی یە[٣].

کۆمەڵگای شارستانی یاخود مەدەنی تەعبیر لەو ساتە پاژەکییە (اللحظة الجزئية) دەکات کە تاکەکان تێدا بەدوای ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان دەگەڕێن،





پاشان دەوڵەت دێتە کایەوە تەعبیر لەو ساتە تاکییە (الفردية) دەکات کە پێکهاتەیەکە لە گشتگیری و پاژەکی [٤].

هێگڵ لە بەشی سێیەمی کتێبەکەی دا(بنەماکانی فەلسەفەی ماف) کە تەرخان کراوە بۆ ژیانی ئەخلاقی، وشەی ئەخلاقی بە مانا فراوانەکەی بەکار دەهێنێت، نەوەك بەمانایەکی تەسك کە لە بەشەکانی پێشتری کتێبەکەی بەکاری دەهێنێت، لەم بەشەیدا هێگڵ بەم شێوەیە وشەی ئەخلاق بەکار دەهێنێت، کە داب و نەریت و عورف و خێزان... هتد دەگرێتەوە، جا لەبەر ئەوە ژیانی ئەخلاقی مانای ژیانی کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت، بەڵام ئەم ژیانە کۆمەڵایەتییە ئەخلاقییەتی تاکی و خودی تێدا بەدی دەکرێت کە لە بەشەکانی دیکەی کتێبەکەی دا باسیان لێوە دەکات[٥].

هێگڵ لە سەرەتای بەشی سێیەمی کتێبی (بنەماکانی فەلسەفەی ماف) دا لە برگەی ١٤٢ دەنوسێت: ژیانی ئەخلاقی تەعبیر لە بیرۆکەی ئازادی دەکات، کە لە لایەکەوە بووەتە چالاکییەکی زیندوو، چالاکییەك لەخودی هۆشیاری خۆیدا مەعریفە و ئیرادەی بە خۆوە گرتووە ، بەهۆی ئەو هۆشیارییە خودییەوە خۆی لە واقیع دەسەلمێنێت ، لەلایەکی دیکەشەوە هۆشیاری خودی لە جیهانی ئەخلاقیدا بنەمای ڕەهایی و ئامانجی خۆی دەدۆزێتەوە کە بزوێنەریەتی . بەم شێوەیە دەبینین ژیانی ئەخلاقی تەعبیر لە چەمکی ئازادی دەکات بەو شێوەیەی کە لەو جیهانەدا گەشە دەکات ، هەروەها تەعبیر لە سروشتی هۆشیاری خودیش دەکات[٦].

هێگڵ کە باس لە ئازادی دەکات ، دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە لای ئەو فەیلەسوفە، ئازادی ماهییەتی عەقڵە، هەر وەك چۆن ماهییەتی مادده بریتییە لە بارستاییەکەی، ماهییەتی عەقڵیش بریتییە لە ئازادی ، مادده هەمیشە بەرەو چەق دەچێت، چونکە خەسڵەتی سەرەکی بارستایی وکێشکردنە (الجاذبية)، عەقڵیش بەرەو ئازادی دەچێت.



لە ڕاستیدا مەبەستی هێگڵ لەئازادی دیاریکردنی خودی یاخود سەربەخۆیی یە، تۆ ئازادی بەو ڕادەیەی کە سەربەخۆی و لە بوونی خۆشتدا پشت بەهیچ شتێکی دیکەی دەرەوەی خۆت نابەستێت، جا لەبەر ئەوە عەقڵ یاخود روح تاکو ئازادی یەکی ڕەسەنی هەبێت دەبێت هەر تەنیا پشت بەخۆی ببەستیت . واتا دەبێت هەر خۆی لە یەك کاتدا بابەت و خود بێت ، لە یەك کاتدا زانا (العارف) و زانراو (المعروف) بێت، ئەوەیە کە هێگڵ پێی دەڵێت (هۆشیاری خودی - الوعي الذاتي)، واتە ئەو هۆشیارییەی کەخۆی دەناسێت کاتێك دەرك بەجیهانی دەرەکی دەکات ، جیهانیش بریتییە لەو ململانێیەی روح، واتا بگاتە ئەو قۆناغەی هۆشیاری خودییە، ئەو قۆناغەی کە روح ئازاد دەبێت، کاتێك دەسەڵات بەسەر جیهاندا دەگرێت و وا جیهان دەناسێت کەموڵکی خۆیەتی [٧] ، کەواتە هۆشیاری خودی ماهیەتی شتەکانە، یاخود ماهییەتی دیاردەکانە، ماهییەتی عەقڵیش ئازادییە.

کاتێك هێگڵ دەڵێت: هۆشیاری خودی لەجیهانی ئەخلاقییدا بنەماو ئامانجی خۆی دەدۆزێتەوە کە بزوێنەریەتی ، ئەو بۆچوونەی ئەرستۆی لە خەیاڵدایە کە سەبارەت بە خواوەند هەیەتی، چونکە خواوەند لای ئەرستۆ ناجوڵێت، بەڵام گەردوون دەجولێنێت، لەبەر ئەوەی گەردوون هۆکاری ئامانجگەرییەتی (علته الغائية)، خواوەند بەهێزی تایبەتی خۆی یاخود ڕاستەوخۆ گەردوون ناجولێنێت ، بەڵکو تەنیا بەهۆی بوونی ئەوەوە گەردوون دەجولێت، هەر وەکو چۆن ئەوکەسەی کە خۆشەویستەکەی دەیجولێنێت ، بۆنمونە چەند گەنجێك کچێکیان خۆش دەوێت وململانێیانە لەسەر خۆشەویستی ئەو کچە ، بەبێ ئەوەی کچەکە ئاگاداری هیچ یەکێکیان بێت ، کچەکە دەبێتە بزوێنەری ململانێی خۆشەویستی گەنجەکان و کچەکە دەبێتە ئامانجی ئەوان و هۆکاری بوونی ململانێیان، بەبێ ئەوەی ئەو ئاگادار بێت و ڕاستەوخۆ بیانجوولێنێت[٨].





کەواتە هۆشیاری خودی لەمیانەی جیهانی ئەخلاقییەوە بنەمای ڕەهایی و ئامانجی خۆی دەدۆزیتەوە ، هەر ئەو جیهانە ئەخلاقییەش بزووێنەری پرۆسەی گەشەکردن و وەرچەرخاندنێتی.

عەقڵ بەردەوام نکوڵی لەخۆی دەکات و خۆی وێران دەکات و هەمیشە ئەو عەقڵە لە جیهانی دەرەکییەوە خۆی بەرجەستە دەکات تا وەکو زیاتر بە هۆشیاری خودی بگات ، بۆئەوەی خودی خۆی بگەڕێنێتەوە و لە دوایشدا تاوەکو نەشونما بکات[٩].

ئیتر بەم جۆرە لە دوا قۆناغی ئەخلاقی کۆمەڵایەتییدا لە میانەی پرۆسەی عەقڵ بۆ گەیشتن بە ماهییەتی خۆی کە ئازادی یە و ئەو ئازادییەش بریتیە لە گەیشتنی عەقڵ بە هۆشیاری خودی ، لە میانەی خێزان وکۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت ئەم پرۆسەیەی عەقڵ بەردەوامی بەخۆی دەدات، دەوڵەت کە دواین قۆناغی ئەم پرۆسەیەیە، تێیدا عەقڵ بە هۆشیاری خودی دەگات، چونکە هەر وەك جان پلامناتر دەڵێت: دەوڵەت لەلای هێگڵ بەرزترین جۆری کۆمەڵایەتییە، کە ڕوح تێیدا ئامانجی خۆی بەدی دەهێنێت و ڕوح ئازاد دەبێت [١٠].

هێگڵ وەك دەروازەیەك بۆ تێگەشتن لە ماهیەتی دەوڵەت هەوڵی ئەوە دەدات کە شوێنەی تاك لە دەوڵەت دا ڕوون بکاتەوە، هەروەها ئازادی ئەو تاکە لەو ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیەی کە دەوڵەتە دیاری بکات، جا لەبەر ئەوە ڕەخنە لە(کانت KANT ١٧٢٤- ١٨٠٤) و سەرجەم فەیلەسوفە لیبرالیستەکان دەگرێت، لەو ڕوانگەوە کەتەنیا بەشێوەیەکی ئەبستراکتی (التجريدي) لە ئیرادەی ئازادی تاکی بیرکەرەوە دەکۆڵنەوەو لێی ورد دەبنەوە، ئەو ئیرادە ئازادە لای هێگڵ بریتییە لە ئازادی هەڵبژاردن، هەروەها ئەو ئیرادە ئازادە شتێکی نا سەلبی نییە، چونکە بەبەردەوامی لە میانەی ڕێکخستنی مەعقوڵی ئازادی دا بەدوای ئازادی دا دەگەڕێت و لێی دەکۆڵێتەوە.






بەپێی بۆچوونی هێگڵ مرۆڤ کە لە کۆمەڵگا و لە جیهانی واقیعی دا دەژیت، نابێت هەر تەنیا پشت بەو قۆناغە ڕەمەکییانە و ویژدانە ئەخلاقییانە ببەستێت، بەڵکو لەسەریەتی کە ئامادەباشی ئەوەشی هەبێت کە بچێتە ژێر ڕکێفی یاسا بابەتییەکانی جیهان کە لە دەرەوەی خودی تاکەوە لە ئارادان [١١].

جا هەر چەندە کەسی تاك بە دوای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا وێڵە، بەڵام بە هۆی عەقڵییەوە ئەو تاکە هەست دەکات کە دەبێت لەو بەرژەوەندییە تایبەتییەی خۆی تێپەڕ بکات، چونکە دەزانێ ناتوانێت لەو بەرژەوەندییە تایبەتییەی خۆی بهێنێتە دی، مەگەر لە ڕێگا و لە میانەی بەرژەوەندییەکی گشتی و گەردوونییەوە نەبێت. جا لێرەدا بەرژەوەندی گشتیی گەردوونی بە تەنیا هیچ بەهایەکی نابێت وئەویش بەدی نایێت ئەگەر بێت و تاکە کەس بەوە نەگات، کە دەیەوێت و ڕازی دەبێت، لەلایەکی دیکەشەوە گشت هەر تەنیا بە کەڵەکەبوونی توانا خودی وبەرژەوەندییە تایبەتییەکان بەدی نایێت، بەڵکو دەبێت هاوگونجاندنێك لە نێوان گشتی و تایبەتی دا هەبێت.

کەواتە مرۆڤ دەبێت لە تاکایەتی خۆی تێپەڕێنێت و بگاتە گشتگیرییەکی گەردوونی، لای هێگڵ ئازادی سنووردارو دیاریکراوە (المحددة المعينة) لەو گونجاندنەی نێوان گشتی و تایبەتی دایە، ئەو گونجاندنەش بەپێی بۆچوونی هێگڵ لە ڕێگای هۆکارێکەوە دەبێت ئەویش دەوڵەتە.

هێگڵ چەندان جار دووپاتی کردۆتەوە کە دەوڵەت هۆکارێکی بەردەوامی گونجاندنی گشتی وتایبەتییە [١٢]. دەوڵەت واقیعی ئازادییەکی بەر دەست و هەستپێکراوی دیاری کراوە.

## ئەنجام

لێرەدا لە کۆتایی باسەکەماندا هەوڵدەدەین ئاکامی باسەکەمان لەسەر تێڕوانینی هێگڵ بۆ فەلسەفەی یاساو دەوڵەت لەم چەند خاڵە چڕ بکەینەوە:

١- کتێبی (بنەماکانی فەلسەفەی ماف)ی هێگڵ کە لە ساڵی ١٨٢١ بڵاوی کردۆتەوە بە بەرهەمی قۆناغی بەرلینی لە بیرکردنەوەی هێگڵ لەقەڵەم دەدرێت[1]. لەم کتێبەدا هێگڵ پوختەی ئەو بیروڕایە سیاسییانەی خۆی خستۆتە ڕوو کە پێشتریش لە نووسینەکانی دیکەی دا باسی لێوە کردبوون، بەڵام لە کتێبی (بنەماکانی فەلسەفەی ماف) دا بە شێوەیەکی ڕێکوپێکتر لە نووسینەکانی پێشتری باسی لە تێڕوانینە سیاسی و یاساییەکانی خۆی کردووە ، جا لەبەر ئەوە دەکرێ ئەم کتێبەی بە بەرهەمێکی نایابی هێگڵ و بیرکردنەوەی ئەڵمانی لە سەدەی نۆزدەهەم دابنێین، کە تێیدا باس لە فەلسەفەی یاسا و فەلسەفەی سیاسەت کراوە . لەم کتێبەیدا هێگڵ باس لە عەقڵی بابەتی دەکات کە لەنێوان عەقڵی خودی و عەقڵی ڕەهادایە ، ئەو عەقڵە بابەتییەی کە لە دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا بەرجەستە دەبێت.

٢- پرۆسەی دیالیکتیکیانەی گەشەسەندنی عەقڵ لە ناو خودی عەقڵی بابەتیشدا بەردەوامی خۆی هەیە. جا لەبەر ئەوە عەقڵی بابەتی سێ قۆناغی سەرەکی بەخۆوە دەگرێت، کە بریتین لە: مافی پەتی (الحق المجرد) و ئەخلاقی تاکەکەسی و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی، هەروەها لەناو هەر یەك لەم بەشانەی عەقڵی بابەتیش پرۆسەی دیالیکتیکیانەی پەرەسەندنی عەقڵ بەردەوامە.

٣- لە میانەی پرۆسەی دیالیکتیانەی پەرەسەندنی عەقڵ دا، هەمیشە عەقڵ بە دوای ماهییەتی خۆیدا دەگەڕێت، هەر وەك چۆن ماهییەتی ماددە بارستاییە، ماهییەتی عەقڵیش ئازادییە، کەواتە هەمیشە عەقڵ بەدوای ئازادی دا دەگەڕێت کە ماهییەت و خاسیەتی سەرەکی خۆیەتی، هۆشیاری خودیش هەر ئەو ماهییەتەی عەقڵە، کە دەبێت عەقڵ پێی بگات. ئەو هۆشیارییەی کە هەست بە بوونی خۆی



دەکات و دەتوانێت خۆی بەڕێوە ببات بەبێ ئەوەی پشت بە هێزی دەرەکی دەرەوەی خودی خۆی ببەستێت.

٤- ئەو هۆشیاری یە خودییەی عەقڵ کە بریتییە لە گەیشتنی عەقڵ بە ماهییەتی راستەقینەی خۆی کە ئازادیەتی، ئەم هۆشیارییە خودییەی عەقڵ لە خودی دەوڵەت دا بەرجەستە دەبێت، چونکە دەوڵەت دوا قۆناغی پەرەسەندنی عەقڵە لە چوار چێوەی ئەخلاقییەتی کۆمەلایەتی، کە سەرەتا بە خێزان دەست پێ دەکات و پاشان بە کۆمەڵگای مەدەنی تێدەپەرێت، ئینجا بەدەوڵەت دەگات، لە دەوڵەتدا ئەوپەڕی گونجاندن لە نێوان تاکی و گشتی دا بەدی دێت، دەوڵەت لای هێگڵ دەبێتە ئەو پانتاییەی کە ئازادی راستەقینە تێیدا بەرجەستە دەبێت[2].

لێرەدا هەندێ رەخنە ئاراستەی بیرکردنەوەی هێگڵ سەبارەت بە دەوڵەت دەکرێت کە زۆرجاران بە سەرتاپاگیری ( Totalitarism) تاوانباری دەکەن [3]، ئەو رەخنەگرانە وای بۆ دەچن کە هێگڵ دەیەوێت تاك لە ناو دەوڵەت بتوێنێتەوە، بەڵام دەوڵەت لای هێگڵ پشت بە ئازادییەکی عەقڵانی دەبەستێت کە تێیدا تاك و کۆمەڵ و تایبەت و گشت هەموو بەیەکەوە تێیدا بەشدارن، دەوڵەت بەرجەستەبووی دەسەلاتێکی سیاسییە، کە دەبێت بە شێوەیەکی رێکخراو شێوازێکی یاسایی مومارەسەی ئیشەکانی خۆی بکات، جا لە بەر ئەوە دەوڵەتی هێگڵ دەوڵەتێکی یاسایی یە، کە دەبێت پلەیەکی بەرزی لێهاتوویی بەرێوەبردنی هەبێت، هەروەها سیستەمێکی رێکوپێکی دادوەریشی هەبێت، تاوەکو بتوانێت پارێزگاری ئاسایش، مافەکانی خاوەنداریەتی، مافەکانی تاکەکان بکات[4] .

ئیتر بەم جۆرە دەوڵەت لای هێگڵ عەقڵێکە لە سەر رووی زەوی دا، کە خۆی ئاشکرا دەکات و دەبێتە شێوازێك و رێکخستنێکی واقعی جیهان . ئیتر بەم شێوە دەتوانین لە ئاکامدا بگەینە ئەوەی کە بڵێین هێگڵ دەیەوێت لە میانەی خستنەرووی فەلسەفە دیالیکتییکەکەی بەعەقڵکردنی دەوڵەت رابگەیەنێت، بەمەش دەیەوێت هەردوو جیهانی عەقڵی و واقیعی بەیەکەوە ببەستێتەوە.





## پەراوێزەکان

**بەندی یەکەم : فەلسەفەی یاسا و فەلسەفەی سیاسی و عەقڵی بابەتی**

١- ارنست كاسير ، الدولة والاسطورة ، ترجمة د. احمد حمدي حمود، الهيئة المصرية ، ١٩٧٥، ص١٦٩.

٢- هيجل ، اصول فلسفة الحق ، المجلد الاول ، ترجمة وتقديم وتعليق د. امام عبد الفتاح امام ، دار التنوير ، بيروت ط ٢ ، ١٩٨٣، ص٨.

٣- هيجل ، المصدر السابق ، ص٦٩ .

٤ – هيجل، المصدر السابق، ص٩-١٠ .

٥- والتر ستيس، فلسفة الروح ، ترجمة د. امام عبد الفتاح امام ، دار التنوير للطباعة والنشر، بيروت ، ١٩٨٣ ، ص٧ .

٦- و.ت . ستيس، فلسفه هيجل، ترجمه د. حميد عنايت ، تهران ، مجلدی دووەم ، ص٥٢١ .

٧- و.ت. ستيس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ل٥٤٩- ٥٦٣، هەروەها بڕوانە هيجل ، مبادئ فلسفة الحق، ترجمة تيسير شيخ الارض، دمشق ١٩٧٤ ، ص.ص ١٩٤،١٤٦،٨٤.

**بەندی دووەم : ماهییەتی عەقڵ و دەوڵەت:**

١- د. شيرزاد احمد نجار ، دراسات في علم السياسية ، اربيل ، ٢٠٠٤، ص ١٨٣ . هەروەها بڕوانە : جان تووشار ، تأريخ الفكر السياسي ، ترجمة د. علي مقلد ، بيروت، الطبعة الثانية، ١٩٨٣، ص٣٨٩ .

٢- هيجل ، اصول فلسفة الحق ، مصدر سابق، ص١٨٧ .

٣- ولتر سيتس ، فلسفة الروح، مصدر سابق، ص ١٠٠ .

٤- هيجل ، اصول فلسفة الحق، المجلد الاول، مصدر سابق، ص ٤٦.





٥- هيجل ، اصول فلسفة الحق، المجلد الثاني ، د.امام عبد الفتاح امام، ص ٣٩٣.

٦- هيجل، المصدر السابق ، ص٣٩٣ .

٧- هيجل ، العقل في التاريخ ، الجزء الاول ، ترجمة د امام عبد الفتاح امام، بيروت. ص٤٨.

٨- هيجل ، اصول فلسفة الحق ، المجل الثاني، مصدر سابق، ص٣٩٣.

٩- جان توشار ، المصدر السابق، ص ٣٨٥

١٠- جان پلامناتر : شرح ونقدی بر فلسفەی اجتماعی وسیاسی هگل، ترجمەء د.حسين بشيريه، تهران ١٣٧١ جاپ دوم، ص١٦٦.

١١- د. شيرزاد احمد النجار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨١ .

١٢- جان توشار ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩ .

**ئەنجام:**

١- د. عبد الرحمن بدوي ، حياة هيجل، بيروت، الطبعة الاولى ١٩٨٠، ص١١٧.

٢- ميشل متياس، هيجل و الديمقراطية ، ترجمة د.امام عبدالفتاح امام، بيروت ، الطبعة الاولى، ١٩٩٠، ص٣١ .

٣ – ميشيل متياس، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

٤- د. شيرزاد احمد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٦.

## دەستپێك

لەم باسەدا باسی هزری هێربێرت مارکیۆز دەکەین، ئەویش لەمیانەی دوو تەوەردا، لە تەوەری یەکەمدا باس لە ژیان و بەرهەم وهزری رەخنەگرانەی مارکیۆز دەکەین، دواتر باس لەکاریگەری هەر یەك لە بیرمەندان هایدگەر و هێگڵ و مارکس و فرۆید لەسەر هزری مارکیۆز دەکەین، کە هەر یەك لەو بیرمەندانە سەرچاوەیەکی هزری مارکیۆز پێکدەهێنن، لە تەوەری دووەمدا باس لە چەمکی ماهیەت دەکەین لە فەلسەفەی مارکیۆزدا.





## تەوەری یەکەم

### ١- ژیان وبەرهەمەکانی مارکیۆز:

هێربێرت مارکیۆز (Herbert Marcuse) فەیلوسوف و بیرمەندێکی بەڕەچەڵەك ئەڵمانییە، لە ١٨٩٧/٧/١٩دا لە بەرلین لە دایکبووە، لە زانکۆکانی بەرلین و فرایبۆرگ خوێندوویەتی و ماوەی سێ ساڵ لە زانکۆی فرایبۆرگ (Freibarg) قوتابی ئەدمۆند هۆسرەل و مارتن هایدگەر بووە.

لە ساڵی ١٩٢٠یشدا بڕوانامەی دکتۆرای لە فەلسەفە لە زانکۆی ناوبراودا وەدەست هێناوە[1].

مارکیۆز لە سەرەتادا پشتگیری لە بزووتنەوەی دیموکراتی سۆسیالستی ئەڵمانی دەکرد. پاشان لەگەڵ ڕۆزا لۆکسمبۆرگ و ماکس هورکهایمەر و ئەدرنو بوونە ئەندامی گرووپێکی سۆسیالیستیی شۆڕشگێر، بەڵام لە ساڵی ١٩١٩دا بە تەواوی پەیوەندی خۆی لەگەڵ بزووتنەوەی دیموکراتی سیۆسیالیستی دەپچڕێنێت. ئەگەر چی لە ساڵی ١٩٢٧یشدا دەبێتە سەرنووسەری گۆڤاری کۆمەڵگا (gesellehaft) کە لە ژێر کاریگەری بزووتنەوەی ناوبراودابوو، بەڵام مارکیۆز بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردووە کە سەر بە هیچ پارتێکی سیاسی نییە.

لە ساڵی ١٩٣٢دا مارکیۆز کتێبێکی لە ژێر ناونیشانی (ئەنتۆلۆژیای هێگڵ و پەیوەندی بە فەلسەفەی مێژووەوە Hegel's ontology and it's relation to his philosophy of history بڵاوکردەوە.

لە ساڵی ١٩٣٣دا کاتێك نازییەکان لە ئەڵمانیا دەسەڵاتیان گرتە دەست مارکیۆز دەچێتە سویسرا و پاشان بۆ پاریس و ئەوسا ڕوو لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات. مارکیۆز لەگەڵ ماکس هورکهایمەر بە دامەزرێنەری ئنستیتۆی

لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی (institute of social research) دادەنرێن، کە لە ساڵی ١٩٢٣ لە فرانکفۆرت دامەزراو پاشان بە قوتابخانەی (فرانکفۆرت) ناسرا، لە ساڵی ١٩٣٣ تا ساڵی ١٩٣٨ مارکیۆز وتارەکانی لە گۆڤاری قوتابخانەی فرانکفۆرت-گۆڤاری (لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی) بڵاوکردۆتەوە، بەڵام پاش باڵادەستی نازیزم لە ئەڵمانیا، بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەرەو دەرەوەی وڵات کۆچ دەکەن و ئەو قوتابخانەیە بۆ ئەمریکا دەگوێزنەوە، پاشان لە زانکۆی (کۆلۆمبیا) بیرمەندەکانی ئەم قوتابخانەیە خەریکی چالاکییە فیکرییەکانی خۆیان دەبن. لە ساڵی ١٩٣٣ قوتابخانەی ناوبراو دەچێتە سویسرا و لەوێشەوە بۆ نیویورک، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٠ هەمدیسان دەگەڕێتەوە فرانکفۆرتی ئەڵمانیا[٢].

لە ساڵی ١٩٤٠ مارکیۆز دەبێتە سەرۆکی بەشی ئەوروپای ڕۆژهەڵات لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی هەواڵدەری (office of intelligence research) کە سەر بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو، پاشان دەچێتە ئەنستیتوی روسی لە زانکۆی کۆلۆمبیا، دواتریش بۆ مەڵبەندی لێکۆڵینەوەی کاروباری روسی لە زانکۆی هارفارد دەچێ.

پەیوەندی مارکیۆز بە (فرانتس نوێمان)[٣] لەو کاتەدا هاتە کایەوە، ئەو کاتەی هەردوو بیرمەند پێکەوە لە کاروباری ستراتیژی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە واشنتۆن کاریان دەکرد، ئەم قۆناغەی ژیانی مارکیۆز بە قۆناغێکی گرنگ لە ژیانی ئەو بیرمەندە دەژمێردرێت، چونکە لەو قۆناغەدا سەرقاڵی کاروباری ستراتیژی دەبێ و دەکەوێتە خزمەتکردنی دەوڵەتی ئەمریکا، بەڵام (ه.ستیورات هیوز) ئەم قۆناغە لە ژیانی مارکیۆز بە قۆناغێکی لاواز و دواکەوتوو دادەنێ، بۆیەکە هیوز لای وایە مارکیۆز هەوڵی دەدا لەم قۆناغە خۆی دەرباز بکات[٤].

کاتێك (فرانتس نوێمان) پاش کارکردنی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەرەو زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیوریۆك چوو، لەوانەبوو مارکیۆز زووتر وازی لەم کارەی دەوڵەت هێنابایە، ئەگەر هاتوو پلە و پایەی پرۆفیسۆری لە زانکۆ پێ بدرابووایە،





بەڵام شتێکی وا روونەدا و مارکیۆز بێ کەس و تەنیا مایەوە، بە تایبەتی لەو کاتەدا کە هەواڵی مەرگی هاوسەرەکەی پێ دەگات، کە لەوانەیە ئەم رووداوە پەکی خستبێ و وای لێکردبێت کە حەز بە گەڕاندنەوەی بۆ ئەڵمانیا نەکردبێت، بۆیە لە واشنتۆن مایەوە. لە دوای مردنی نوێمان، مارکیۆز هەمدیسان ژنی هێنایەوە و بێوەژنی فراتنس نوێمانی بێوەژنی کردە هاوسەری خۆی. لێرەوە قۆناغێکی دیکە لە ژیانی مارکیۆز دەست پێدەکات و دەچێتە ناو ژیانی زانکۆوە.

لە تەمەنی نزیك شەست ساڵیشدا مارکیۆز گەیشتە پلەی پرۆفیسۆر، ئەمەش بە پشتبەستن بە خۆی توانی ئەم بێ دەنگییە درێژخایەنەی بشکێنێ[٥]. لە ساڵی ١٩٤١ مارکیۆز کتێبی (عەقڵ و شۆڕش) Reason and Revolution بڵاودەکاتەوە، کەتێیدا پتر لە کتێبی پێشووی لەمەڕ هێگڵ، لە فەلسەفەی هێگڵ قووڵدەبێتەوە. لە ساڵی ١٩٦٠ لە پێشەکی چاپی دووەمی ئەم کتێبەدا ئەوە دەردەخات کە مەبەستی لە نووسینی ئەم کتێبە تەنیا زیندووکردنەوەی هێگڵ نەبووە، بەڵکو زیندکردنەوەی جیهانی عەقڵە کە مەترسی لە ناوچوونی لێدەکرێ کە بریتییە لە توانای بیرکردنەوەی نێگەتیڤی[٦].

لە ساڵی ١٩٥٥ دا مارکیۆز کتێبی (ئیرۆس و شارستانی Eros and Civilization) بڵاودەکاتەوە، کە بووە هۆی ئەوەی وەکو یەکێك لە بیرمەندانی لایەنگرانی قوتابخانەی چەپە فرۆیدییەکان بناسرێت.

پۆڵ رۆبنسۆن لە کتێبەکەی خۆیدا بە نێوی چەپی فرۆیدی ( the ferudian left) دەنووسێت: کارێکی ئاساییە مارکیۆز نووسەری (ئیرۆس و شارستانی) بابەتی ئەو لێکۆڵینەوەی بێت لەمەڕ چەپی فرۆیدی، چونکە ئەوەی جێی باسکردن بێ ئەوەیە، لە نووسینەکانی پێش ئەم کتێبەیدا بە هیچ شێوەیەك راستەوخۆیانە خولیای فرۆیدیزمی لادەرناکەوێ، تا بەم جۆرە مارکیۆز وەسف بکەین و بڵێین یەکێکە لە نوێنەرە سەرەکییەکانی کەلتوری رادیکاڵی لە سایکۆژیادا[٧].

له ساڵی ١٩٥٨ ماركیوز كتێبی (ماركسیزمی سۆڤیەتی) بڵاودەكاتەوە و رەخنە له ماركسزمی ئەرسۆدۆكسی دەگرێت كەئەو كات له یەكێتی سۆڤیەتدا پیادە دەكرا. هەندێ له نووسەرانیش لەو باوەڕەدان كه نووسینی ئەم كتێبه ئاكامی ئەو كاركردنەی ماركیوز بووه له نووسینگەی هەواڵدەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا[٨]. بەڵام له پێشەكی چاپی فەرەنسییەكەی كه پاش شەش ساڵ له بڵاوبوونەوەی چاپی ئەمریكاوە دەرچووە، ماكیوز دەنووسێت: من لەو كتێبەدا ئەو گریمانە دەخەمە روو كه دەڵێ (كزی و لاوازی هێزی شۆڕشگێرانە له كۆمەڵگا پێشكەوتووەكانی رۆژئاوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرۆسە چالاكانەی كه سەرمایەداری رێكخراو ئەنجامی داون. هەروا بەردەوامبوونی رژێمی توتالیتاری له كۆمەڵگای سۆڤیەتی (هەروەها دوو ئاراستەی پێكەولكاون) بوونەتە هۆی ئەوەی پارتە كۆمۆنیستەكان ببنە میراتگری مێژووی پارتەكانی پێش شەڕی سوسیالیزمی دیموكراسی[٩] ، پاشان له ساڵی ١٩٦٤ ماركیوز كتێبی (مرۆڤی تاك رەهەند one dimension man) بڵاودەكاتەوە، كه تێیدا رەخنه له كۆمەڵگای سەرمایەداری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەگرێت. بەمە خاڵی هاوبەشی نێوان هەردوو رژێم لەوەدا دەبینێتەوە كه مرۆڤ لەم رژێمانە تووشی تاك رەهەندی بووه و ئازادی ژیانی خۆی له دەستداوە.

ماركیوز له نێوان ساڵانی ١٩٥٤ تا ١٩٦٧ له زانكۆی براندیس مامۆستابووە و پاشان چۆتە زانكۆی كالیفۆرنیا. لەوانەیە مانەوەی ماركیوز له زانكۆی براندیس بۆ ماوەیەكی زۆر (نزیكەی پازدە ساڵێك) بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كه ئەو بیرمەندە خۆی له بنەماڵەیەكی بەڕەچەڵەك جوولەكە لەدایكبووە و نەیتوانیوە دەستبەرداری رەچەلەكی خۆی بێ. چونكه جوولەكەكانی ئەمریكا زانكۆی براندیسیان دامەزراندبوو، ئەم زانكۆیە وەك داڵدەدەری ئەو رۆشنبیرە جوولەكانەی لێهاتبوو كه له ئەمریكا دەژیان، دیارە ئەمەش مانای هاوسۆزی ماركیوز دەگەیەنێ بۆ رەچەڵەكی جوولەكایەتی خۆی، لەبەر ئەوەیە لەم بارەیەوە رەخنەی ئەوەی لێدەگیرێ كه



نەیتوانیوە وەك ماركس واز له رەچەڵەكی خۆی بێنێ، بەڵكو بەردەوام پێیەوە بەسترابۆوە[١٠].

له ساڵی ١٩٦٥ ماركیوز به هاوكاری دوو هاوڕێی خۆی كتێبی (رەخنەی لێبوردنی پەتی Acrtiqe of pure tolerance) بڵاودەكاتەوە، كه خۆی به وتاری (بەخشینی داپلۆسێنەرانە – التسامح القمعي) بەشداری تێیدا دەكات و باس لەو دەكات كه (رێپێدانی ئەم شێوازە دیموكراسیانه له دەوڵەتە پیشەسازییە پێشكەوتووەكان جگه له هەڵخەڵەتاندن هیچی دی نییە) ئەو كاتەی ئەو رژێمانە رێگا به كەمایەتییەكان (الاقليات) دەدەن به سەربەستی راو بۆچوونی خۆیان دەربڕن. ئەمەش تەنیا جەخت لەسەر ئەوە دەكات، كه راو بۆچوونی ئەوانە هیچ كاریگەرییەكی ئەو تۆی نییە[١١]. ماركیوز لەم وتارەیدا پەردە لەسەر ساختەیی و قەڵپی پرنسیپی دڵفراوانی و لێبوردەیی له كۆمەڵگای سەرمایەداری لادەدات و رووی دزێوی دیموكراسی له كۆمەڵگای هاوچەرخی سەرمایەداری دەست نیشان دەكات.

ساڵی ١٩٦٧ ماركیوز دەچێتە زانكۆی كالیفۆرنیا و بۆ ماوەیەكی زۆر لەوێ دەبێتە مامۆستای زانكۆ[١٢]. له هاوینی ١٩٦٨ كاتێ راپەڕینی قوتابییان له ئەوروپا سەریهەڵدا، ماركیوز وەك بیرمەندێكی سەردەم كه بەدەربڕی روحی ئەم راپەڕینە دادەنرێ، نێوبانگی به هەموو دنیا بڵاو دەبێتەوە.

له ساڵی ١٩٦٩ ماركیوز (وتارێك دەربارەی ئازادیبوون) بڵاودەكاتەوە و لەساڵی ١٩٧٠دا (پێنج لێكچەر دەربارەی سایكۆلۆژیا و سیاسەت و یۆتۆپیا) و له ساڵی ١٩٧٢شدا (لێكۆڵینەوە له فەلسەفەی رەخنەیی) بڵاودەكاتەوە، ئەم دوو كتێبەشی بریتین لەو وتارانەی كه له ساڵانی (١٩٣٢-١٩٦٩) نووسیبووی.

له ساڵی ١٩٧٢ ماركیوز كتێبی (دژە شۆڕش و یاخیبوون) چاپ دەكات. پاشان له هاوینی ١٩٧٩ له ئەڵمانیای رۆژئاوا ماڵ ئاوایی له دنیا دەكات.





## ٢- هزری ڕەخنەگرانەی مارکیۆز:

هەرچەندە مارکیۆز خاوەن زەخیرەیەکی فەلسەفی و فیکری تایبەت بە خۆی بووە کە لەساڵانی بیست و سییەکانی ئەم سەدەیە بەدەستی هێنابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بیرمەندە لە مەیدانی فەلسەفەدا شوێنێکی دیاری نەبوو، جگە لەوەی کە پلەی پرۆفیسسۆری لە زانکۆکاندا پێ بەخشرابوو. بەڵام ئەو ڕووداوانەی کە لە هاوینی ١٩٦٨ لە سەرجەم ئەوروپا بە تایبەتی لە فەرەنسا هەموو خوێنگاکانیان گرتبۆوە وای کرد مارکیۆز وەك مژدەبەخشی بزووتنەوەی قوتابیان و پاشان وەك بیرمەندێکی سەردەم بناسرێ. ئیتر لەو کاتەوە ناوی لە هەموو کۆڕ و کۆبونەوەیەکدا دەهاتە بەرگۆی و وەك کەسایەتیەکی خاوەن فیکری سەردەم باس دەکرا. بە تایبەتی لە لایەن ڕابەرانی بزووتنەوەی قوتابیانەوە زۆر گرنگیان پێدەدا و بە یەکێك لە بیرمەندانی پێشڕەوەی بزووتنەوەکەیانیان دادەنا.

ئەگەرچی مارکیۆز تا ئەو کاتەی بزووتنەوەی قوتابییان دەستی پێکرد پێشبینی بزووتنەوەیەکی وای نەدەکرد، بەڵام پێش ئەم سەرهەڵدانە لە نووسینەکانیدا پێشبینی ئەوەی دەکرد بزووتنەوە و یاخیبوونی ئەو چین و توێژە کۆمەڵایەتیانە لە ئەنجامی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیدا ڕۆڵ دەگێڕن، ئەوانەی لە پەراوێزی بەرهەمهێناندا دەژین، وەك بێکار و تێهەڵدراوانی سەر شۆستەکان و کەمایەتییە چەوساوەکانی تر.

ئەوەی کە مارکیۆز بیری لێ نەکردبوونەوە و باسی نەکردبوون قوتابیان و ڕۆشنبیران بوون، بەڵام لە کتێبی (مرۆڤی تاك ڕەهەند) لە ساڵی ١٩٦٤دا بەڕستەیەکی والتر بنیامن کە لە سەردەمی فاشیزمدا نووسیوویەتی کۆتایی بە کتێبەکە دەهێنێ و دەڵێت: هیچ تروسکاییی و هیوایەك بۆ ئێمە نەماوەتەوە، تەنیا تروسکاییی ئەو بێ هیوایانە نەبێت کە تروسکاییی هیوامان پێبەخشن[١٣].



بەپێی بۆچوونی مارکیۆز چینی کرێکاران لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی ڕۆڵی شۆڕشگێڕی خۆیان لە دەستداوە، ئەمەش بە هۆی عەقلانیەتی تەکنۆلۆژیا لەو کۆمەڵگایانەوە. تەکنۆلۆژیا هونەری زاڵبوون و کۆنترۆڵکردنی سروشتە، زانستی گۆڕینی شتە سروشتییەکانە بۆ کەرەستەی پێویست، بە مەبەستی دەست بەسەراگرتن و سوودلێوەرگرتن، لە پێناو هێنانەدی ئامانجە کۆمەڵایەتی و شارستانییەتەکاندا.

لێرەدا هیچ کەسێ ناتوانێ نکۆڵی لە ڕۆڵی خزمەتگوزاری تەکنەلۆژیا بکات، بەڵام کاتێ لە سایەی ڕژێمی سەرمایەداری هاوچەرخدا تەکنۆلۆژیا لە هونەری سوود وەرگرتن لە سروشتەوە دەگۆڕێ بۆ دەستبەسەرداگرتنی مرۆڤ، ئەوا ئەو کاتە لە بڕی ئەوی ببێ بە هێزی پێشکەوتن، ئەوا دەبێتە ڕێگرێك لە بەردەم ئازادبوونی مرۆڤدا، بە هۆی بە کەرستە کردنی مرۆڤ. لێرە مارکیۆز بانگەشەی هەرەسهێنانی گەشبینی مارکسیزم دەکات، کە پێیوایە پەرەسەندنی مێژوویی لە حوکمکردنی مرۆڤ بەرەو زاڵ بوون بەسەر شتەکاندا دەچێت. مارکیۆز ڕەشبینانە دژی ئەم گەشبینییەی مارکسیزم ڕادەوستێ، بە تێبینی کردنی ئەوەی زاڵبوون بەسەر شتەکان بە ئاکامی ئەوە گەیشت تا حوکمی مرۆڤ بکات و بۆ هەمیشە لە خزمەتی خۆی بەکاری بێنی[١٤].

بە پێی شیکردنەوەی مارکسیزمیش دەربارەی پەیوەندی پرۆلیتاریا بە تەکنەلۆژیاوە، کاریگەرە کۆمەلایەتییەکانی شۆڕشی نوێی تەکنەلۆژیای لە دوو ئاستدا ڕەنگی داوەتەوە:

یەکەمیان: کەمکردنەوەی ڕۆڵی پرۆلیتاریا لە بەرهەمهێنان.

دووەمیش: گۆڕینی بونیادی چینایەتی پرۆلیتاریا. پاش ئەوەی پرۆلیتاریا هێزی شۆڕشگێڕانەی خۆی لە دەستدەدات، بە هۆی ئاوێتە بوونی لەگەڵ کۆمەڵگای سەرمایەداری هاوچەرخ.

بە پێی بۆچوونی مارکیۆزیش تاکە هیوایەکی شۆڕش کە مابێ لای ئەم چین و توێژە کۆمەڵایەتیانەیە کە ڕاستەوخۆ نەکەوتونەتە ژێر ڕکێفی عەقلانیەتی





تەکنەلۆژیا و لە پەراوێزیدا دەژین. واتا تەنیا ئەم چین و توێژە دەتوانن ڕۆڵی شۆڕشگێڕی لە وەرچەرخاندنی کۆمەڵگادا بگێڕن، کە تێکەڵ بە سیستەمی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای تەکنولۆژیای نەبووینە. عەقڵانیەتی تەکنەلۆژیاش لەوەدا دەردەکەوێ کە بەشێوەیەکی ڕێککرداری بەرهەمهێنان ئەنجام دەدرێت و ژیانێکی خۆش بۆ ڕێژەیەکی فراوانی ئەندامەکانی کۆمەڵگا دابین دەکرێ. هەر جۆرە بەرهەڵستیکردنێکیش لەناو کۆمەڵگادا بە کارێکی ناعەقڵانی لە قەڵەم دەدرێت، چونکە تەجاوزکردن لەم جۆرە کۆمەڵگایە، کە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر پێشکەوتن بەدەست دێنێ، کارێکی ناماقوڵە.

ئەگەر سەرنجێکی وردی ئەم جۆرە عەقڵانییەتە بدەین، دەبینین ئەم جۆرە عەقڵانییەتە دیاردەیەکی رووکەشانەیە و جەوهەوری سەرمایەداری فەرامۆش دەکات. لێرەدا مارکیۆز ناعەقڵانییەت لە ناو ئەم عەقڵانییەتە، واتە لەناو خودی عەقڵانیەتی هەڵبەستراو و لۆجێکی ناوەوەی رژێمی سەرمایەداری هاوچەرخ دەبینێ. لەبەر ئەوەی ئەو پێوەرەی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوو پشتی پێ دەبەستێت و دەیکاتە پاساوی عەقڵانییەتی سیستەمەکەی، بریتییە لەو شێوازە نوێیەی بەرهەمهێنانی کە زۆر بەخێرایی گەشە دەکات و ئاسۆی تازە لە بەردەم تێرکردنی پێداویسییەکانی مرۆڤ دەکاتەوە. بەڵام مارکیۆز لەگەڵ ئەو بۆچوونەی مارکس دایە، کە گەشەکردنی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای سەرمایەداری نابێتە هۆی گەشەکردنی پێداویست وبەهرەکانی مرۆڤایەتییەکان بەشێوەیەکی ئازاد و سەربەستانە. چونکە داپلۆسینی سەربەستی بەهرە و پێداویستەکانی مرۆڤایەتییەکان مەرجی بەردەوامی گەشەکردنی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییە.

لێرەدا مارکیۆز پەرە بەو بۆچوونەی مارکس دەدات، ئەویش لە میانەی جیاوازیکردن لە نێوان پێداویستییە ساختەکان ( پێداویستە دروستکراوو چەسپێندراوەکان) لە گەل پێداویستییە ڕاستەقینەکان ( پێداویستییە سروشتی و خۆرسکییەکان)، لە کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوو پێویستی بەوە هەیە کە



پێداویستی ساختەو درۆزنانە دروست بکات، ئەمەش نەك هەر تەنیا بۆ زامنکردنی بەردەوامی گەشەکردنی بەرهەمهێنانی، بەڵکو بۆ نەهێشتنی هەموو جۆرە ناکۆکییەك و دابینکردنی تەبایی کۆمەڵایەتی لە ناو کۆمەڵگا، بۆ ئەوەی مرۆڤی تاك ڕەهەند درووست بکات، کە کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوو بەشێوەیەکی گشتی قبووڵ بکات، چونکە پێداویستیە ساختەکانی ئەو مرۆڤە تاك ڕەهەندە تێیدا جێبەجێ دەکرێت [١٥].

لە ڕاستیدا ناوبانگ دەکردنی مارکیۆز لە کاتی ڕاپەڕینی قوتابییان لە ساڵی ١٩٦٨دا و دەربڕینی ئەو گوتەیەی کە دەڵێ نووسینەکانی مارکیۆز تەعبیر لە خواست و ویستی ئەم ڕاپەڕینە دەکات، جێگای سەرنجدان و لێوردبوونەوەیە، چونکە هەر وەك باسمان کرد پێش ئەم وەختە ئەو بیرمەندە بە هیچ شێوەیەك باس لە قوتابییان ناکات، کە بتوانن ببنە پێشەنگی شۆڕشگێڕان. بەڵکو باسی ئەوانە دەکات کە لە پەراوێزی کۆمەڵگادا دەژین. بەڵام دیارە پڕوپاگەندەی سەرمایەداری ئەو کاتە ئەمە دەقۆزێتەوە و مارکیۆز وەکو ڕابەرێکی بزوتنەوەی قوتابیان بە جیهان دەناسێنێت.

ڕاگەیاندنەکانی سەرمایەداری بیروبۆچوونەکانی مارکیۆزی بۆ بەرژەوەندیەکانی ڕژێمەکەی بەکاردەهێناو پتر پڕۆپاگەندەی بۆ ئەوە دەکرد کە ئەوبیرمەندە مژدەبەخشی ڕاپەڕینی قوتابییانە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە شان و باڵهەڵدانێکی هەڵخەڵتێنەرانەبوو، تاوەکو ڕاپەڕینەکە ستراتیژیەتی ڕاستەقینەی خۆی ون بکات و قوتابیانیش لە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتییەکان دابڕێن و گۆشەگیربن، بۆیە دوای ماوەیەکی کەم لە جاڕدانی پڕوپاگەندەکە دەسەڵاتداران گەیشتنە مەرامی خۆیان و ڕاپەڕینەکە دامرکایەوە و لە ماوەی چەند مانگێکی کەم شوێنەوارێکی بەرچاوی لە کۆمەڵگای ئەورووپی و فەرەنسادا نەما.





ئەم شۆڕشەی قوتابییانیش پرۆژەیەکی راستەقینەی بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا لانەبوو و هیچی پێنەکرا. بەڵکو لە سەرووبەری واقیعی فەرەنسادا وەك بزووتنەوەیەکی رادیکالیزم هات و کوژایەوە[١٦].

بەڵام ئەگەر ئەم شۆڕشەی قوتابییان شان بە شانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی کۆمەڵگای فەرەنسی کاری بکردبووایە و گۆشەگیر نەبووایە، ئەوا بێگومان ئاکامێکی چاکی لێدەکەوتەوە.

دوای ئەوەی چینی کرێکاران لە گۆڕەپانی سیاسیدا تووشی شکست هات و خەونی بیرمەندەکانی بزووتنەوەی پرۆلیتاریا نەهاتەدی، بە شێوەیەکی چاوەڕوانکراو چینی کرێکاران و بزووتنەوەکەی پاشەکشەی کرد، رێگاش خۆش بوو بۆ گەشەکردنی فاشیزم، بەتایبەتی لە پاش شەڕی جیهانی یەکەم لە ئەوروپا، فاشیزم برەوی سەند، بۆیە بیر لەوە کرایەوە بە چاوێکی دیکە سەیری شۆڕش بکرێ، ئەوە بوو لە کۆتایی چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا تەوژمێکی فیکری سەریهەڵدا کە بە مارکسیزمی رەخنەیی ناوی دەرکرد، ئەوانەی کە بیرکردنەوەی رەخنەیی کۆی دەکردنەوە دواتر قوتابخانەیەکی فیکریان دامەزراند کە بە قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسراوە، ماکس هورکهایمر و تیۆدۆر ئەدرنوو والتەر بنیامین و هێربێرت مارکیۆز و یورغن هابرماز و چەندانی تر بە فەیلسوفەکانی ئەم قوتابخانەیە دادەنرێن، ئەم بیرمەندانە گرنگییەکی تایبەتیان بە سەردەمی رۆشنگەری دەدا، چونکە لەم کاتەدا رەخنە لە بواری فیکریدا شوێنێکی تایبەتی هەبوو. بیری رەخنەی بەشێوەیەکی زانستییانە بۆ یەکەم جار لە سەردەمی رۆشنگەریدا سەریهەڵداو لەو سەردەمدا بایەخی زۆری پێدرا.

بە هۆی نووسینەکانی کانت (رەخنە لە عەقڵی پەتی) و (رەخنە لە عەقڵی پراکتیکی) رەخنە گەیشتە لوتکەی گەشەکردن. فەیلەسوفەکانی فرانکفۆرتیش بە بەکارهێنانی چەمکی رەخنەیی سەرلەنوێ فەلسەفەی مارکسیزم تاوتوێ دەکەن. فەلسەفەی نێگەتێفیزم لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا دەبێ بە رەوتی سەرەکی بیرکردنەوەی



فەیلەسوفەکانی، بۆیە رەخنەگرتن لە فەلسەفەی پۆزیتیڤیزم( الفلسفة الوضعية) بووە ئەرکی سەرەکییان. مارکیۆزش بایەخێکی زۆری بە فەلسەفەی نێگەتیڤیزم داوە و هەر لەو روانگەیەشەوە رەخنەی لە فەلسەفەی پۆزیتیڤیزم گرتووە. ئەگەر سەرنجیش بدینە بیری مارکیۆز، بۆمان دەردەکەوێ کە بیروبۆچوونەکانی ئەو بیرمەندە لەوەوە سەرچاوە دەگرن کە رەخنەی لە دوو جۆر بیرکردنەوە گرتووە:

١- ئەو جۆرە بیرکردنەوەی کە فەلسەفە لە سەرووی واقیع دادەنێ و لە سەرووی کات و مێژووەوە سەیری دەکات.

٢- ئەو بۆچوونەی لەسەر بنەمایەکی ئەزمونگەریی (تجريبي) رووت بونیادنراوە.

بۆیە لە سەرەتادا وامان دێتە بەرچاو کە مارکیۆز ئاشنایەتی لەگەڵ بیری بیرکردنەوەی ئەزمونگەریدا هەیە، چونکە مارکیۆز دەیەوێ فەلسەفە لەسەر بنەمای — کۆنکریتی-عینی- دابمەزرێنێت، بەڵام لە راستیدا فەلسەفەی ئەزمونگەری هیچ جۆرە ئاشنایەتیەکی لەگەڵ بیروباوەڕی مارکیۆزدا نییە، چونکە رێبازی ئەزمونگەری پابەندی ئەو واقعیەیە کە هەیە، بێ ئەوەی برەو بەوەبدات کە ئاخۆ ئەم واقیعە لەناو خۆیدا چی هەڵگرتووە؟ ئەزموون ناتوانێ دەرك بە جەوهەری واقیع بکات کە لێی دەکۆڵێتەوە، ئەو واقیعەی رەنگە توانای جۆراوجۆری گۆڕانکاری لەناوخۆ شاردبێتەوە، بەڵام ئەزموون ناتوانێ راستەوخۆ لە دیوی دەرەوەی واقیع هەستی پێ بکا. لێرەدا مارکیۆز دەڵێ: فەلسەفە تووشی گرفتێکی گەورە دەبێ، کاتێك بەشێوەیەکی سەد دەر سەد پابەندی واقیعی بەرچاو دەبێ، لە جیاتی ئەوەی بتوانێ هەوڵی ئەوە بدات بەردەوام واقعێکی لە بارتر بهێنێتە بەرچاو، بەو واقیعە رازی نەبێت کە هەیە[١٧].

لەدیماهی ئەم برگەیەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە زۆرجاران مارکیۆز لە میانەی خستنە رووی بیروبۆچوونەکانیدا دەکەوێتە ناکۆکی، جا لەبەر ئەوە دەبینین ئەلسدیر ماکنتیر لە کتێبەکەیدا لەسەر مارکیۆز کۆمەڵێ پرسیاری رەخنەیی دەخاتە روو، ئەو ناکۆکییە فیکیریانەش دەوروژێنێ کە مارکیۆز تێی کەوتووە، یەکێك لە رەخنەکانیشی ئەوەیە کە مارکیۆز لە هەموو نووسینەکانیدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ





کە ئەو پێوەرانە ڕەت دەکاتەوە کە لە سەرجەم فیکرە فەلسەفییەکاندا حەقیقەتی پێ دیاری دەکرێ، لە کاتێکدا کە مارکیوز خۆی هیچ پێوەرێکی ئەلترەناتیڤ بۆ حەقیقەت ناخاتەڕوو[18].

لای مارکیوز باوەڕهێنان بە واقیعی بەردەست باوەڕهێنانە بە خۆبەدەستەوەدان و بە ناڕاستییەکان، کەوابێ وەك **ماکنتیر** دەپرسێ: تێڕوانینی تایبەتی مارکیوز دەربارەی حەقیقەت چییە؟ هەر لەم پرسیارەشدا پرسیارێکی دی دروست دەکات و دەڵێ؟ مارکیوز لە نووسینەکانیدا دەیەوێ ئەوە بخاتە روو کە هەر تیۆرێك پێوەری خۆی بۆ حەقیقەت هەیە، کەواتە ئەگەر ئەم حەقیقەتەش پەیوەست بێ بەکات و شوێنی دیاریکراوەوە بۆچی ئێمە بەراوردی لە نێوان ئەم تیۆرانە بکەین کە لە کات و شوێنی جیاجیادا سەرهەڵدەدەن[19].





## ٣- سەرچاوەکانی هزری مارکیوز

زەنجیرەی فیکریی مارکیوزیش زەخیرەیەکی دەوڵەمەندە و جەمسەرە هەرە گرنگ و بەناو بانگەکانی فیکری تازەی رۆژئاوا خۆیان لە ناویدا حەشاردراوە، بۆیە باس کردن و دیاریکردنی پەیوەندی مارکیوز بەمانە باشترین رێگایە بۆ تێگەیشتن دەرباری فەلسەفەکەی ئەو بیرمەندە. گرنگترین ئەو بیرمەندانەش کە کاریگەریان لە دروستکردنی فیکرو فەلسەفەی مارکیوزدا هەبووە بریتین لەم بیرمەندانە: هایدگەر و هێگڵ و مارکس و فرۆید.

### یەکەم: هایدگەر و مارکیوز

مارکیوز لە ساڵی ١٩٢٢ بەسەرپەرشتی مارتن هایدگەری فەیلەسوفی وجودی لە زانکۆی فرایبۆرگ بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە، بۆ ماوەی شەش ساڵیش پاش وەرگرتنی بڕوانامەکە لە دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەیەك لە بەرلین کاری کردووە، پاشان لە ساڵی ١٩٢٩ گەڕاوەتەوە زانکۆی ناوبراو، ئەوسا لە ژێر دەستی ئەدمۆند هۆسرەل و مارتن هایدگەر خەریکی خوێندنی فەلسەفە بووە[20] بێگومان هەردوو مامۆستاکەی ( هایدگەر و هۆسرەل) کاریگەری خۆیان لەسەر مارکیوزی قوتابی هەبووە، بەڵام ئەوەی کە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە مارکیوز پتر پەیوەندی بە هایدگەرەوە هەبووە، بۆیە کاریگەری هایدگەر پتر بەسەریەوەبووە، ئەگەرچی هەوڵی ئەوەی داوە، کە خۆ لەم کاریگەرێتییە دەرباز بکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبووە.

ه. ئیستیورات هیوز لەم رووەوە دەڵێت: مارکیۆز سێ ساڵ لە زانکۆی فرایبۆرگ لە ژێر سەرپەرشتی هۆسرەل و هایدگەر خوێندویەتی و بڕوانامەی فەلسەفی وەرگرتووە بە تایبەتی هایدگەر کە بە ڕێنمایی ئەو مارکیۆز لە لاویدا یەکەمین کتێبی دەربارەی ئەنتۆلۆژیای هێگڵ نووسیوە، دووریش نییە دژایەتیکرنی تەکنۆلۆژیای تازە لەلایەن مارکیۆزەوە لە ژێر کاریگەرێتی هایدگەرەوە بووبێت[٢١].

لە راستیدا لە کتێبی (ئەنتۆلۆژیای هێگڵ) بە شێوەیەکی روون وئاشکرا ئەم کاریگەرییەی هایدگەر بەسەر مارکیۆزەوە دەردەکەوێت، ئەم کتێبەش بڕوانامەی لێهاتووی ئەکادیمی و تێزی دکتۆراکەیەتی، بە هۆی ئەم کتێبەشەوە مارکیۆز دەرفەتی بۆ دەرخسێ تا لە زانکۆ وانە بلێتەوە، هایدگەریش یارمەتی داوە تا ببێ بە وانەبێژ **—محاضر-** لە زانکۆی فرایبۆرگدا، بەڵام بەهۆی دروستبوونی بیروبۆچونی جیاواز لەلای هەریەکەیان پەیوەندییەکەیان رووی لە خراپی کردووە.

ئەو کاتەی مارکسیزم وەك فیکرێکی واقیعی بەرەو پێشەوە دەچوو، هایدگەر لە لایەنی سیاسیەوە ئارەزووی خۆپارێزانەی هەبوو کە لەگەڵ رەوتە رادیکالییەکان یەکیان نەدەگرتەوە. کەچی مارکیۆز بەجدی پەیڕەوی چەپگەریی مارکسیزمی دەکرد، بۆیە زانکۆی (فرایبۆرگ)ی جێهێشت و چووە شاری فرانکفۆرت[٢٢]. بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە مارکیۆز بە تەواوی توانیبێتی لە ژێر کاریگەری هایدگەر خۆی دەرباز کردبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم کاریگەرێتییە لە دیوی ناوەوەی بیرکردنەوەی مارکیۆز خۆی حەشاردابوو.

هایدگەر پاش گیریگارد بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی بوونخوازی (**الوجوية**) دەژمێردرێ، لای هایدگەریش حەقیقەت هەمیشە بەندە بە ناحەقیقەتەوە، نا حەقیقەتیش لە پێش حەقیقەتدا هەیە و بنچینەی بوونە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو هەوڵ و کۆششەکانی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت هیچ سوودێکیان نییە، چونکە هەمیشە ناحەقیقەت زاڵە، بۆیە هایدگەر پێشنیای گۆڕینی بوونیادی





ئەنتۆلۆژیای گشتی دەکات بۆ بووناسی تایبەتی، کە بابەتەکەی بریتییە لە توێژینەوە لە ماهیەت و خودی مرۆڤ و زەمەنی وجودی تایبەتی مرۆڤ.

یەکێك لە سیفەتەکانی مرۆڤیش لای هایدگەر ئەوەیە کە مرۆڤ هەمیشە پەیوەستە بە کۆمەڵێ شتی دەوروبەرەوە، کە ناوی دەنێت —وەقائعییەت Facticite- واتا مرۆڤ هەمیشە بوونی لەناو ئەوانی دیکەدا (**الآخرين**) هەیە، ئەمەش نەك بەو مانایەی وەك چۆن بەرد لە کەناری دەریا یا ماسی لەناو دەریادا هەیە، بەڵکو بەو مانایەی مرۆڤ لە دەوروبەری خۆیدا چەند شتێ دەبینێ و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، لەبەر ئەوە دەبینین بوونی ئەو مرۆڤە بە پێی بوونی ئەو شتانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات دیار دەکرێت یا دەستنیشان دەکرێت[٢٣].

مرۆڤ بێ ویستی خۆی فڕێدراوەتە ئەو جیهانەی تێدا دەژیت، چەمکی جیهانیش لای **هایدگەر** ئەو گەردوونە پان و بەرینە نییە، کە زانا فەلەکی و جیۆگرافیاناسان باسی لێوەدەکەن، بەڵکو ئەو جیهانەیە کە لەگەڵ خودی مرۆڤدا تێکەڵدەبێت و کار لە مرۆڤ دەکات، وەقائعییەتیش بەمانایەکی دی وەقائیعی کەسی یان خودیە، کە بریتییە لە میکانیزمی هۆ و ئاکامە شاراوەکانی سروشت. ئەوەی لە خودی هەموو کەسێکدا هەیە، ئەوەی من لە خودی خۆمدا هەیە، وەقائیعییەتێکی تایبەتییە و بریتییە لەوەی کە من بە هۆی جیهانەوە هەم ، بەو مانایەی کە جیهانی من، جیهانی خۆمە و ناکرێت بێ من هەبێت، بە هەمان شێوەش ناکرێ منیش بێ ئەو جیهانە بوونم هەبێت[٢٤] .

ئەو فەلسەفە خودیەی کە هایدگەر بانگەشەی بۆ دەکات بریتییە لەواز هێنان لە هەموو پراکتیکێکی واقیعی، یاخود وازهێنان لە شێوازی بابەتیانە لە کاتی لێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و ئابوورییەکان، ئەم فەلسەفەیەی هایدگەریش تەنیا گرنگی بە خود دەدات، واتا فەلسەفەیەکی خودی پەتییە ((الفلسفة الذاتية الخالصة)) و تەنیا گرنگی بە خود دەدات، ئەو خودەی بوونی دنیا بەرامبەر مەرگ دادەنێ [٢٥].

لێرەدا کاتێ لە بیروڕاکانی مارکیۆز ورد دەبینەوە، ئەوا بە روونی کاریگەری فەلسەفەی خودی پەتی هایدگەری تێدا دەدۆزینەوە، ئەو رەوتە بیرکردنەوەیەی هایدگەر وا لەم فەیلەسوفە دەکات لە کۆتاییدا ببێ بە فەیلەسوفێکی حزبی نازی، تا ئەو رادەیەی لە کەسێتی هیتلەردا حەقیقەتێکی راستەقینەی بەرجەستەکراوی ئەڵمانیا ببینێ، ئەوەتا کاتێك هایدگەر قسە بۆ قوتابییەکانی دەکات دەڵێ: لە ئەمڕۆ و لە د وارۆژدا وامەکەن بیروڕاکان بن بە بنچینە و رێسا بۆ بوونتان، چونکە حەقیقەت و یاسای ئەڵمانیا بریتییە لە فوهرەر[٢٦] .

فوهرەر لای هایدگەر رەمزی کۆمەڵە کەسێکی هەڵبژاردەیە کە هۆشیارییەکی راستەقینە بەرجەستە دەکات، ئەو هۆشیارییە راستەقینەیەی بەندە بە بوونەوە، بۆیە مارکیۆز کەم تا زۆر لە ژێر کاریگەرێتی ئەم رەوتە بیرکردنەوەیەدایە[٢٧] . لەبەر ئەوەی ئەو گرووپە دەستەبژێرەی لای هایدگەر بە حەقیقەتی راستەقینەی دادەنرێ، لای مارکیۆزیش ئەو گرووپە دەستەبژێرە دەبن بە پێشەنگی گۆڕانکارییە مەزنەکان.

## دووەم: هێگڵ و مارکیۆز

پاش ئەوەی مارکیۆز خوێندنەوەی تایبەتی خۆی دەربارەی هایدگەر ئەنجامدا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە فەلسەفەی مامۆستاکەی رەگ و ریشەی دەچێتەوە سەر فەلسەفەی هێگڵ، ئیتر لەم قۆناغەدا وەرچەرخانێکی فیکری گەورە بەسەر فیکری مارکیۆزدا هات، لە ساڵی ١٩٢٨یش بەدواوە مارکیۆز هەرگیز نەیدەتوانێ دەستبەداری فەلسەفەی هێگڵ ببێ، لە ساڵی ١٩٣٢شدا مارکیۆز تێزی دکتۆراکەی لە ژێر ناونیشانی (ئەنتۆلۆژیا لای هێگڵ و پەیوەندی بە فەلسەفەی مێژووەوە) دەنووسێ و ئەویش لە ژێر سەرپەرشتی هایدگەر ئەم کارەدەکات.





لەم کتێبەیدا مارکیۆز باس لە پەیوەندی مێژوو بە چەمکی زەمەن و جوولە و ژیان لای هێگڵ دەکات و ئەوە دەخاتە روو کە بوون لای هێگڵ بریتییە لە جولە و ژیان[٢٨]، هەروەها بە شێوەیەکی فراوان باس لە کتێبی (لۆجێك)ی هێگڵ دەکات، بەڵام خۆ لە بەهای رەخنەیی و وتەزاکانی ئەنتۆلۆژیای هێگڵ لادەدات... هەروەها باس لەوەش ناکات کە هێگڵ و مارکس بیرکردنەوەکەیان لە یەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاوە.

لە راستیدا مارکیۆز پتر گرنگی بە پەیوەندی نێوان هێگڵ و دلتی (Dilthy) داوە، لەوەی کە گرنگی بە پەیوەندی نێوان هێگڵ و مارکس دابێت. واتا مارکیۆز هەمان ئەم لایەنانە دەخاتەڕوو کە پێشتر مێژوونووسانی فەلسەفە دەربارەی هێگڵ خستویانەتە ڕوو، مارکیۆز بە بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە(ئەنتۆلۆژیا لای هێگڵ و پەیوەندی بە فەلسەفەی مێژووەوە) ی زۆر دڵخۆش نەبووە، بۆیە تەنها بە زمانی ئەڵمانی چاپی کرد، لێرەدا هەقە ئەوەش بڵێین ، کە لەم تێزەیدا مارکیۆز زۆر بە دەگمەن باس لە فەلسەفەی هێگڵ دەکات.

لە ساڵی ١٩٤١ مارکیۆز کتێبێکی دی لەسەر هێگڵ بڵاودەکاتەوە کە بەناونیشانی (عەقڵ و شۆڕش-هێگڵ و دروستبوونی تیۆری کۆمەڵایەتی) کە پێچەوانەی کتێبی پێشوو، هەوڵەکانی بۆ باسکردنی چەند لایەنێکی نوێ و باسنەکراو لە فەلسەفەی هێگڵ دەردەکەوێ. لە کتێبی (عەقڵ و شۆڕش)دا ئەو تەنیا ئەوەی ناوێ، کە خۆی خەریکی پرسیارێکی گرنگ دەربارەی عەقڵەوە بکات و بزانێ ئاخۆ عەقڵ دەتوانێ رۆڵێکی شۆڕشگێرانە لە ژیانی مرۆڤدا بگێڕێت؟ چونکە دەمێك بوو عەقڵ مانا شۆڕشگێڕانەکەی خۆی لە دەست دابوو ، بەدرێژایی مێژووش عەقڵ وەك هێزێکی بنچینەی پارێزگاری لە بارودۆخی باو دەکرد، هەر یاخیبوونێکیش لە ئارادابووبێ، ئەوا عەقڵ ویستوویەتی دای بمرکێنێتەوە، تا پارێزگاری لە بارودۆخە باوەکە بکات، ئەمەش مێژووی عەقڵە لە فیکری خۆرئاوادا، هەر لە سەردەمی یۆنانەکانەوە تا سەدەی هەژدەهەم.

بارمیندس یەکەمین فەیلەسوفی یۆنانییە کە عەقڵ و چەقبەستن و نەگۆڕانی بە یەکەوە گرێداوە، تا ئەو ڕادەیەی نکۆڵی لە ڕوودانی هەر گۆڕانکارییەك دەکات کە لە ژیانی مرۆڤدا رووبدات، ئەفلاتۆن و ئەرستۆش گرنگیان بە عەقڵ داوە و تەجاوزی ئەو بۆچوونەی بارمیندسیان کردووە کە دەڵێ: عەقڵ سیفەتێکی جێگیر و نەگۆڕی هەیە. لە رۆژئاوادا پێش سەدەی هەژدەهەم بۆ ئەوەی دڵنیابن لەوەی کە فەیلەسوفێك باوەڕی بە گۆڕان هەیە یا نا، ئەوا پێشوەخت هەوڵی ئەوە دەدرا، ئاخۆ تا چ ڕادەیەك بەرگری لە عەقڵ دەکات، چونکە هەر فەیلەسوفێ بەرگری لە عەقڵ بکردایە، ئەوا دەردەکەوت کە فەیلەسوفەکە باوەڕی بە گۆڕان نییە، بە پێچەوانەش راستبوو، لەبەر ئەوە هەر فەیلەسوفێ عەقڵانی بوایە لە رووی پراکتیکییەوە بڕوای بە نەگۆڕان و خۆپارێزی هەبوو، ئەگەر ئەزمونگەریش بوایە ئەوا باوەڕی بە گۆڕان و وەرچەرخان هەبوو.

مارکیۆز لە کتێبی (عەقڵ و شۆڕش) دا دەیەوێت پێمان بڵێ کە تا سەردەمی هێگڵ لە سەدەی (١٨) عەقڵ سیفەتێکی جێگیر و نەگۆڕێ هەبووە، بەڵام لە سەردەمی هێگڵدا عەقڵ مانایەکی دی بەخۆوە دەگرێ و دژی مانا کۆنەکەی دەوەستێ کە بریتییە لە یاخیبوون و شۆڕشگێڕیەتی، یاخیبوون و شۆرشکردن دژی بارودۆخی باو و وەستاو بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری تێیدا[٢٩].

هێگڵ فەیلەسوفێکی ئایدیالیزمی بوو و مارکیۆزیش تێڕاوانینی تایبەتی خۆی دەربارەی ئایدیالیزم هەبووە، ئەو لای وایە ئایدیالیزم ئەو بیرکردنەوەیە کە سیستەمێکی گونجاو و ڕێکوپێك لە جیاتی واقیعێکی ئەزمونیی شێواو دادەنێ، کە لە خودی عەقڵ و فیکردا سەرهەڵدەدا، بەم پێیە، کاتێ ئایدیالیزم لەسەر ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا کاردەکات، ئەوا مەبەستی ئازادکردنی کۆمەڵگەیە لە هەموو جۆرە داپلۆسین و سەرکوتکردنێك، کە بە هۆی هۆکارە ڕەمەکی و ناعەقڵانییەکانەوە یا بێ پشتبەستن بە عەقڵەوە ئەنجام دەدرێن، بۆ نموونە پێداویستیەکانی بازاڕ و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی قازانجی زۆرتر و رکابەرایەتی نێوان دەزگا بەرهەمهێنەرەکان، ئەمانە هەموویان ئەو واقیعە شێواز و پڕ ئاژاوەیە پێکدێنن، کە مرۆڤی هاوچەرخ تێیدا



دەژین، بۆیە ئایدیالیزم باشترین فریادڕەسێکە بۆ دەربازکردنی مرۆڤ لەم بارودۆخە ئالۆزە.

کاتێك مارکیۆز باسی ئایدیالیزم دەکات ئەوا ئەو بیرمەندە پتر مەبەستی فەلسەفەی ئایدیالیزمی ئەڵمانییە و بە فەلسەفەیەکی شۆڕشگێڕانەی لە قەڵەم دەدات، هێگڵ لای مارکیۆز رابەری فەلسەفەی ئایدیالیزمی ئەڵمانییە، چونکە لای ئەو هێگڵ رۆڵێکی شۆرشگێڕانەی بە عەقڵ بەخشیوە، کە بەدرێژایی فیکری فەلسەفی رۆژئاوا هەر لە سەردەمی فەلسەفەی یۆنانییەوە عەقڵ لێی بێ بەشکرابوو، لەم روانگەیەشەوە مارکیۆز رەخنە لەوانە دەگرێت کە فەلسەفەی ئایدیالیزمی ئەڵمانیا بە فەلسەفەیەکی خۆپارێز و کۆنەپەرست و ناشۆڕشگێڕانە دەزانن، لەبەر ئەوە لە پێشەکی کتێبی (عەقڵ و شۆڕش) دادەنوسێت: بە نووسینی ئەم کتێبە هیوادارم بەشدارییەکی بچووك بکەم نەك هەر تەنیا لە زیندوکردنەوەی هزری هێگڵ، بەڵکو لە زیندوکردنەوەی ئەو توانا عەقڵخوازییەی مەترسی فەوتانی لێدەکرێت، کە توانای بیرکردنەوەی نێگەتیڤیزمییانەیە (التفكير السلبى)، ئەو بیرکردنەوەیەی هێگڵ واپێناسەی دەکات: لە بنچینەدا رەفزکردنی ئەو شتانەیە کە راستەوخۆ دەکەونە بەرچاومان[٣٠].

بەپێی بۆچوونی مارکیۆز لۆجیکی هێگڵ سیفەتێکی رەخنەیی شۆڕشگێڕانەی هەیە، چونکە ئەو بە درێژایی مێژووی فەلسەفە پێی وایە لۆجیك لە میانەی کارکردنیدا فیکر و واقیعی لێك جیاکردۆتەوە، جا لەبەر ئەوەی لۆجێك لە دەرەوەی واقیعدا کاردەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەستەوەستان بوەستێ لە گۆڕینی واقیعدا، بەڵام کاتێ لۆجێکی هێگڵ دێتە ئارا، سیفەتی پێشوویی نامێنێ، بەڵکو لە فەلسەفەی هێگڵدا لۆجێك بە قووڵایی واقیعدا رۆدەچێ و لەناو کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا پرۆسەی خۆی ئەنجام دەدا، کە ئەمەش توانای عەقڵ نیشاندەدا لە رێکخستن و بەرێوەبردندا[٣١].

مارکیۆز وەك هێگڵ لەو باوەڕەدایە کە بوون جەوهەری هەموو شتێکە، و فیکر لە رێی پرۆسەی تایبەتی خۆیدا دەرکی پێدەکات. بوون لە کات و شوێنی دیارکراودا





نییە، بەڵکو تەنیا بیرۆکەیەکە. فەلسەفەی هەردووکیانیش لەم موفارەقەیە — پارادۆکس - ( paradox ) یەك دەگرنەوە کە دەڵێت: ئەوەی حەقیقییە مەوجود نییە، ئەوەی مەوجودە حەقیقی نییە[٣٢]. هەروەها ئەو دوو بیرمەندە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کە بوونی شتێك لە جەوهەردا جیاوازە لە ئیمکانی راستەقینەی بوونی ئەو شتە. بۆیە دەبێ هەموو هەبوویێك لە پێناو گەیشتن بە هەبوویێکی چاکتر هەوڵبدات، چونکە ئەو حاڵەتەی ئەو تێیدایە، ئەوا ئەو هەبووە راستەقینەیە نییە کە پێویستە و دەبێ هەبێ.

مارکیۆز لەگەڵ هێگڵ دایە کە دەبێ بیری فەلسەفی لە جیهانێکی دوولایەنیدا گوزەر بکات، هەروەها لای وایە بۆ ئەوەی بتوانین بەمانای قوڵی هەر دیاردەیەك بگەین دەبێ لەگەڵ دژەکەی بەراورد بکرێت، بۆ نموونە دەبێت ناحەقیقەت لەگەڵ حەقیقەت و بەندایەتی لەگەڵ ئازادی بەراورد بکرێت[٣٣]. هەروەها لای مارکیۆز هەروەك هێگڵ پرۆسەی بیرکردنەوە، رێگایەکی نێگەتیڤیزمییانە دەگرێتە بەر.

بۆ نموونە لە سەرەتادا بیرکردنەوە بە خستنەرووی تێزێکی پۆزەتیڤی دەستپێدەکات، کە لە هەمانکاتدا لە لایەن تیزێکی نێگەتیڤیەوە رەفز دەکرێتەوە. ئەمەش دەبێ لە میانەی پرۆسەی بیرکردنەوەدا بخرێتەروو، ئەوسا لە نێوان هەردوو تێزەکەدا، تێزێکی نوێ بخوڵقێنرێ. ئەمە و پرۆسەی بیرکردنەوە بەرانبەر ئەم تێزە نوێیەش تێزێکی نێگەتیڤی دی دادەنێ، بەم جۆرە بیرکردنەوە بەردەوام و بێوەستان لە کارکردندایە[٣٤] .

هێڵی سەرەکی فەلسەفەی هێگڵ لەم بۆچوونانەدایە و کرۆکی فەلسەفەی هێگڵیش لەوە سەرچاوە دەگرێ، کە مێژووی مرۆڤ و سروشت هەمیشە لە جووڵە و گەشەکردندان بۆ گەیشتن بە بیرۆکەی رەها، ئەمەش لە ئەنجامی ململانێی نێوان دژەکان و پەرەسەندنی پەیوەندییە دیالیکتیکییەکان دێتەکایەوە، ئەگەرچی مارکیۆز ئەم جۆرە بۆچوونانەی لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی هێگڵ هەڵبژاردووە و لەگەڵ رەوتی گشتی





فیکری خۆیدا گونجاندوویەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رەخنەیەکی راستەوخۆ و ئاشکرای لە هێگڵ نەگرتووە.

لەم بارەیەوە ئەلسدیر ماکنتیر دەڵێ: لێکۆڵینەوەی مارکیۆز دەربارەی هێگڵ شێوازی رەخنەگرانە وەرناگرێ، تەنیا ئەو کاتە نەبێ، کە لە دوای باسکردنی کتێبی (لۆجێك) ی هێگڵ دێتەسەر فەلسەفەی سیاسی. بە بۆچوونی ئەویش رەگ و ریشەی هەڵەی بیروبۆچوونی هێگڵ لەوەدایە، کە باوەری تەواوی بە رژێمی سیاسی دەسەڵاتدار لە دوای ساڵی ١٨١٥ەوە هەبووە، ئەمەش مانای وایە کە مارکیۆز لەو باوەڕەدایە کە ناوەرۆکی فەلسەفە و تیۆری هێگڵ هەڵەی تێدا نییە، بەڵکو هەڵەکە لە پراکتیککردنی ئەو فەلسەفەیەدایە لە ژیانی سیاسیدا[٣٥].

### سێیەم: مارکس و مارکیۆز

فەلسەفەی مارکیۆز لە ئاکامی نوشوستی هێنانی بزووتنەوەی کرێکاری و سوسیالیستیەکان لە ئەوروپادا هاتە کایەوە، ئەو کاتەی فاشیزم سەرکەوتنی بەدەستهێنا و هەموو هێزێکی کۆمەڵایەتی ئازادیبەخش لە کۆمەڵگای سەرمایەداری رووی لە کزی کرد و بەرەو نەمان چوو، حزبی کۆمۆنیست دەستەوەستان وەستا لە بەرچاوخستنی وێنەی ئەو یۆتۆپیایەی، کە ماوەیەکی زۆر بوو لە تاریکستانی فەلسەفەی ئایدیالیزمی و مارکسیزمیدا خۆی حەشاردابوو[٣٦] .

ئەلسدیر ماکنتیر لەبارەی وەرچەرخانی هزری مارکیۆز لە کاریگەری هزری هێگڵ بەسەریەوە بۆ کاریگەری هزری مارکس دەنووسێت: لەراستیدا کاتێك مارکیۆز لە بەکارهێنانی راڤەکردنی هێگڵەوە وەرچەرخا بۆ راڤەکردنی مارکس، تەنیا بەرگێکی وەسفکردنی هێگڵی بۆ گەیشتن بە بیری رەها، خستە بەر راڤەی مارکسی بۆ کومەڵگای برجوازی و ئابووری سەرمایەداری [٣٧].

ماركیۆز لە كاتی گەشەكردنی فیكرییدا و گەڕانەوی بۆ كاریگەرێتی فەلسەفەی هێگڵ لەسەر هایدگەر رووی كردە فەلسەفەی ماركس، واتە لە دوای دیالیكتیكی خودی بابەتی هێگڵ كەوتە ژێر كاریگەری دیالیكتیكی مەتریالیزمی ماركسەوە.

وەك ئاشكراشە دیالیكتیكی مەتریالیزمی رێك پێچەوانەی دیالیكتیكی هێگڵە، چونكە لە جیاتی ئەوەی بوونی كۆمەڵایەتی وسروشتی تەعبیركردنێكی بەرجەستەكراو بێت لە بیرۆكەی رەهابووندا، وەك چۆن لای هێگڵ وایە، كەچی لای ماركس، فیكر و هۆشیاری مرۆڤ رەنگدانەوی بوونی كۆمەڵایەتییە، واتا بارودۆخی كۆمەڵایەتی، هۆكاری بابەتیانە هۆشیاری مرۆڤ دیاریدەكات نەك بە پیچەوانەوە[٣٨] .

هەر چەندە لە گەشەكردنی فیكری ماركیۆزدا دەردەكەوێ كە لە دوای كاریگەری فەلسەفەی ئایدیالیزمی خودی هایدگەر دەكەوێتە ژێر كاریگەری ئایدیالیزمی بابەتیینانەی (المثالیة الموضوعیة) هێگڵ، پاشان فەلسەفەی مەتریالیزمی ماركس، بەڵام لۆسیان گۆلدمان دەڵێت: ماركیۆز لە یەك كاتدا كەوتۆتە ژێركاریگەری هایدگەر، هێگڵ، ماركسەوە .گۆلدمان ئەم شێوە كاریگەرییەی ماركیۆز لە هەندێ لایەندا لەسەر ئاستی فەلسەفی بەشێوازی كاریگەریی جۆرج لۆكاش و كارل كۆرش دەشوبهێنێ[٣٩] .

ماركیۆز لە بلاوكردنەوەی هێلكارە ئابووری و فەلسەفییەكانی ساڵی ١٨٤٤ی ماركسدا، پەیوەندییەكی راستەقینەی نێوان ماركس و هێگڵ دەدۆزێتەوە، لەم بارەیەوە ماركیۆز دەڵێ: دەتوانین بڵێین بلاوكردنەوەی ئەو نووسینەی ماركس لە ساڵی ١٨٤٤ خاڵی وەرچەرخانە لە مێژووی لێكۆڵینەوەكانی ماركسیزم و دەكرێ لە رێی ئەم هێلكارییانەوە بنچینەكانی مەتریالیزمی دیالیكتیكی و مەغزا راستەقینەكانی بخەنیە بەر گفتوگۆر و بەتێڕوانینێكی تازەوە سەیری سوسیالیزمی زانستی بكەین. ئەم هێلكارییانە بەرێگایەكی زۆر ماقوڵ و باوەڕ پێهێنەر مەسەلەی بوونی پەیوەندی حەقیقەتی نێوان ماركس و هێگڵ دەخەنەڕوو[٤٠] .





ماركیۆز لە (عەقڵ و شۆڕش) هەوڵدەدات ئەو پەیوەندییانە بخاتە روو كە لە نێوان نووسینە سەرەتاییەكانی ماركس و فەلسەفەی هێگڵدا هەیە، تا رادەیەكی زۆرباش جیاوازییە بنچینەكانی نێوان ئەم دوو فەیلەسوفە فەرامۆش دەكات و تەنیا جەخت لەسەر هێلە سەرەكییە فیكرییەكانیان دەكات كە سەر بە فەلسەفەی رەخنەیی و نێگەتیڤیزمیین.

بەپێی بۆچوونی ماركیۆز، ماركسیزم فەلسەفەیەكی پێشكەوتووخوازە، چونكە ماهییەتی مرۆڤ بە مێژووی دیاریكراوی گەشەكردنی مرۆڤایەتی نابەستێتەوە، بەڵكو مرۆڤ دەبێ لە هەموو ساتێكی مێژوویدا بژی و دژی ئەو بارودۆخەی تێیدا دەژی بوەستێ و بەرابنەری دەستەوەستان نەبێ. ئامانجیش لە هەموو سەردەمێكدا هێنانەدی ژیانێكی تازە و رەفزكردنی ئەو واقیعەی تێیدا دەژی بۆ هێنانەدی واقیعێكی دی. ئەمە جەوهەری فەلسەفەی ماركسیزمە، ئەم بۆچوونەش بە درێژایی گەشەكردنی فیكری لای ماركیۆز ئامادەیی خۆی هەبووە، هەر چەندە شێوازی جۆراوجۆریشی بە خۆوە گرتووە. رەخنەگرتنی ماركیۆزیش لە فەلسەفەی پۆزیتڤیتیزم لەم بۆچوونەی ماركس سەرچاوە دەگرێ. جا لەبەر ئەوە ئەگەر كاریگەری هایدگەر و هێگڵ لای ماركیۆز زیاتر روویەكی فەلسەفییانەی هەبێ، ئەوا كاریگەری ماركس، هەروەها كاریگەریی نیتشە توانای ئەوەیان بە ماركیۆز بەخشیوە كە بتوانێت بەشێوازێكی زۆر چالاك لە رووی شارستانی و ئایدیۆلۆژیەوە و رەخنە لە كۆمەڵگای هاوچەرخ بگرێت[٤١] .

ماركیۆز كاتێ سەیری تەنگوچەلەمەكانی كۆمەڵگای هاوچەرخ دەكات و لە مەینەتییەكانی مرۆڤ دەكۆڵێتەوە، ئەوا ناچار دەبێ پەنا بۆ ئەو فەلسەفانە ببات كە هەمیشە گروتینی ئەوەیان هەیە لە هەموو سەردەمێكدا دیاردەكان راڤە بكەین و بۆ گۆڕینیان ئاسۆیەك دیار بكەین. وەنەبێت ماركیۆز بۆچوونەكانی ئەو فەلسەفانەش دەقاودەق وەرگرێ و بیەوێ رابردوو لە جیاتی ئێستا بدوێ، بەڵكو هەمیشە هەوڵدەدات ئەو ساتە مێژووییەی تێیدا دەژی بە یارمەتی فەلسەفە شەن وكەو بكات. جا ئەگەر

ئەو واقیعەی ئەو تێیدا ژیاوە دیاردە و تەنگوچەلەمەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتبێت، ئەوا ئەویش ناتوانێ بە تەفسیرکردنی فەلسەفەکانی پێشتر رازی بێ، بەڵکو لە هەوڵ و کۆششی ئەوەدا دەبێ، چەمکە فەلسەفییەکان لە ژێر رۆشنایی سەردەمی خۆی تاوتۆی بکات و بیانخاتە روو، هەروەها رازی نابێ دیماگۆجیانە پێیانەوە پەیوەست بێ.

ئەگەرچی زۆرجاریش ئەو هەوڵدانەی وای لێکردووە زیادەڕۆیی لە لێکدانەوە و بەراوردکردنی ئەم چەمکە فەلسەفییانە و سەردەمی خۆی بکات، هەر بۆیە لە لایەن مارکسیستە ئەرسۆدۆکسیەکانەوە مارکیۆز بەوە تاوانبار دەکرێ کە فەیلەسوفێکی لادەرە لە مارکسیزم، واتە ریڤیژنیستە.

چونکە بەپێی بۆچوونی مارکیۆز چینی کرێکاران لەگەڵ رژێمی سەرمایەداریدا ئاوێتەبووە و هێزی شۆڕشگێرانەی نەماوە، کە لە سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم هەیبوو، لەبەر ئەوەی رژێمی سەرمایەداری لە رێی شێوازی بەرهەمێنانی نوێی و بەگەڕخستنی عەقڵانیەتی تەکنیکییەوە توانیویەتی تا رادەیەك خۆشگوزەرانی بۆ چینی کرێکاران دابین بکات و کەف و کوڵی یاخیبووان و دەنگی ناڕەزایی دابمرکێنێتەوە. نەك هەر ئەوە، بەڵکو لە کۆمەڵگای ئیستهلاکیدا، سەرمایەداری تا رادەیەکی زۆر توانیویەتی کۆمەڵگا بە چاکی کۆنترۆڵ بکات و ئارەزوو و خەونی مرۆڤ بەپێی ویستی رژێمەکەی هەڵبسوورێنێت و دژە شۆڕش بەرانبەر بزووتنەوەی چەپەکان بەرپا بکات و مەیلی شۆڕشگێڕی لەناو کۆمەڵگا کز بکات.

لەگەڵ ئەم هەموو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر کۆمەڵگەی هاوچەرخدا هاتوون، مارکیۆز لەو باوەڕدایە فەلسەفەی مارکس وەك فەلسەفەیەکی رێنیشاندەر بۆ کارکردن، گڕ و تینی خۆی لە دەست نەداوە. بۆیە لە ساڵی ١٩٧٢ لە یەکێ لە نووسنیەکانی دەڵێت: فەلسەفەی مارکس لە بارودۆخی ناشۆڕشگێڕانەشدا رێنیشاندەرە بۆ پەیڕەوکردن، بەڵام لێرەدا پەنجە دەخەینە سەر خاڵێکی لاوازی دیکەی بزووتنەوەی چەپی تازە کە تیۆری مارکسی شێواندووە و کردوویەتی بە تەقسێك (ئاینێك).





روون و ئاشکراشە کە ئەو چەمکانەی لە شیکردنەوەی سەرمایەداری لەسەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەکارهێندراون، ناکرێت هەمان ئەم چەمکانە لە قۆناغی ئێستای سەرمایەدارییدا بەکاربهێنرێن، چونکە چەمکەکان لە خودی خۆیاندا چەمکی مێژووین و نیشانەی مێژووییان هەڵگرتووە و ئەو بوونیادەش کە شیدەکەنەوە بونیادێکی مێژووییە[٤٢] .

مارکیۆز هیوای بەوە هەبوو کە بتوانێ فەلسەفەی مارکس لەو تەقسە رزگار بکات کە کردبووی بە فەلسەفەیەکی بێ توانا و بێ هێز و دەستەوەستان لە تەفسیرکردنی کۆمەڵگای هاوچەرخ، ئەمەش وای لێکرد ببێ بە یەکێك لە بیرمەندەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئەو قوتابخانەیەی، کە بەوە ناسراوە بیرمەندەکانی لە هەوڵی ئەوە دابوون تا فەلسەفەی مارکس لەو تەنگوچەلەمەیە رزگار بکەن، کە دوای شۆڕشی سەرنەکەوتووی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩١٨ بەسەرکردایەتی روزالوکسمبرگ تێی کەوتبوو. ئەو بیرمەندانە دەیانویست بە تێڕوانێکی رەخنەگرانەوە کلتووری فەلسەفەی مارکس بخوێننەوە و لە ژێر رۆشنایی گۆڕانکارییەکانی چارەکی یەکەمی سەدەمی بیستەم هەڵی بسەنگێنن، مارکیۆز لە کتێبی (مارکسیزمی سۆڤیەتی)دا رەخنە لە مارکسیزمی ستالینی دەگرت، لای مارکیۆز دەوڵەتی سۆڤیەتی رژێمێکی داپلۆسێنەرانەی لە ژێر حوکمی ستالینی سەرمایەداری -کە بە نێوی سوسیالیزم حوکمی دەکرد- لێکەوتەوە. چینێکی بیروکراتی، دەوڵەت بەڕێوە دەبەن و بەپێی پیلانێکی مەڵبەندی گەشەکردن و بەرهەمهێنان پێویستی تاکەکانی دەوڵەت دابین دەکەن، ئەو پیلانەی دەوڵەت سەرجەم بوارەکانی فیکر و زمان و هونەر و ئەخلاق کۆنترۆڵ دەکات، تاك لە رژێمی سۆڤیەتیدا کارکردنی بەسەردا فەرزکراوە و هیچ ئازادییەکی بۆ نەماوەتەوە، بۆیەکە ئەم تاکە، مارکیۆز بە مرۆڤی تاك رەهەند ناوی دەبات، هەر وەك چۆن لە رژێمی سەرمایەداریشدا مرۆڤ لە ژێر سیستەمێکی بیرۆکراتی داپلۆسێنەر دەبێتە مرۆڤی تاك رەهەند.

ئەگەرچیش کتێبی (مارکسیزمی سۆڤیەتی) مارکیۆز بە بەرهەمی ئەو کاتەی کە لە دەزگایەکی موخابەراتی ئەمریکی کاری دەکرد دەژمێردرێ، بەڵام لە هەمانکاتدا شیکردنەوەکەی مارکیۆز لەو کتێبەیدا شێوازێکی رژێمی سەرمایەداری هاوچەرخیش بەشێوەیەکی ئاشکرا دەخاتەروو، لای مارکیۆز دەوڵەتی سۆڤیەتی و دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی دیکەی جیهان هیچ جیاوازییان لە رووی جەوهەری چەوساندنەوە و داپلۆسینی مرۆڤدا نییە.

عەقڵانیەتی تەکنەلۆژی لەو رژێمانەدا زاڵە و دیسپلینێکی داپلۆسینەرانەی فراوان بەرهەمهێنان و دابەشکردن رێك دەخات و کاتەکانی کارکردن و پشوودانیش کۆنترۆڵ دەکات، تاك لە هۆشیاری تایبەتی و بەهرەو داهێنانەکانی و ئارەزووەکانی دادەماڵێ بۆ بەدەست هێنانی کۆیلایەتییەکی نیمچە بەختەوەر. مارکیۆز پێی وایە رژێمی سۆڤیەتی لەسەر بنەمای سەرمایەداری دەوڵەتی دامەزراوە، بۆیە ئاماژە بە قسەیەکی لینین دەکات کە لە ساڵی ١٩١٨دا کردوویەتی، کە دەڵێ (سەرمایەداری دەوڵەتی بە نیسبەت ئێمە هەنگاوێکە بۆ پێشەوە). هەروا پێشی وایە سیاسەتی سۆڤیەتی لە ساڵی ١٩٢١ بەدواوە دەکەوێتە ژێرکاریگەری هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەڵمانییەوە، چونکە سەرنەکەوتنی ئەم شۆرشە لە ساڵی ١٩١٨دا پێویستی بەوەدەکرد سەرلەنوێ چاو بە پەرەسەندنی نێو دەوڵەتی بخشێندرێتەوە[٤٣].

مارکیۆز لە کتێبی (مارکسیزمی سۆڤیەتی) نایەوێ رەخنە لە خودی فەلسەفەی مارکسیزم و سۆسالیزم بگرێت، بەڵکو رەخنەی لە رژێمی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دەگرێت، کە لای وابوو لە میانەی پیادەکردنی سۆسیالیزمدا خودی فەلسەفەی مارکسیزمیان شێواندووە، لە راستیدا لەم کتێبەدا هەروەك د. فوئاد زەکەیا دەڵێ: مارکیۆز رەخنەی لەو شێوازەی مارکسیزم گرتووە کە لە سۆڤیەتدا پەیڕەو دەکرا[٤٤].



**چوارەم: فرۆید و مارکیۆز**

بەپێی بۆچوونەکانی مارکیۆز، تاك رەهەندی مرۆڤ بۆتە نەخۆشییەکی کوشندەی سەردەم، لە کۆمەڵگای سوسیالیزمی سۆڤیەتی و سەرمایەداری ئەمریکا و ئەورووپادا لەیەك ئاستدا، بەڵام بەشێوەی جیا جیا، ئەم رژێمانە مرۆڤیان تووشی تاك رەهەندی کردووە، لە هەموو شتێ بێبەرییان کردووە. عەقڵانیەتی تەکنەلۆژیای سەرجەم ژیانی مرۆڤایەتی کۆنترۆڵ کردووە، بیرۆکەی شۆڕشی لەناو کۆمەڵگا بە جارێ سڕیوەتەوە، هەموو شتێ ئاماژە بە هێشتنەوەی بارودۆخەکە دەکەن کە وەکو خۆی بێ .

لێرەدا مارکیۆز بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەك و پێشبینیکردنی شارستانیەتێکی نوێ لە دوای پەنابردنە بەر هێگڵ و مارکس هانا بۆ فرۆید دەبات، بۆ نەخشەدانان و دیاریکردنی ئەو کۆمەڵگایە تازەیەش دەیەوێ بیر و بۆچوونەکانی فرۆید بەشێوەیەکی جیاواز لێك بداتەوە، تا کەلێنەکانی فیکری مارکسی پێ پڕبکاتەوە، واتا گونجاندنی بۆچوونەکانی فرۆید لەگەڵ نووسینە سەرەتاییەکانی مارکس و تێکەڵکردنیان لەگەڵ هەندێ بیروڕای نیتشە، بەشێوەیەك کە بیروڕایەکی وابەرهەم بێنێ کە لەگەڵ سەردەمی نوێدا بگونجێ[٤٥].

مارکیۆز پێی وایە مارکس زیاتر لە رووی ئابووری و کۆمەلایەتییەوە گرنگی بە ئازادکردنی مرۆڤەوە داوە، کەچی لایەنی دەروونیی تاکەکەسی فەرامۆشکردووە، واتا لای مارکیۆز، مارکس بە گشتی مەرجە مادیەکانی ئازادکردنی مرۆڤی دیاری کردووە، بەڵام لە رووی دەروونییەوە پشتگوێی خستووە. هەرچەندە مارکیۆز ئاماژە بەوەش دەکات، کە هێڵکارییەکانی مارکس هەندێك سەرەخاڵیان دەربارەی ئازادکردنی مروڤ لە رووی دەروونییەوە تێدا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مارکیۆز پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە سایکۆلۆژییەتی مارکسی بەرچاوناکەوێ، هەرچەندە خۆی لەگەڵ بۆچونەکانی مارکسیش دایە کاتێ دەڵێ، مێژوو بریتییە لە ململانێی

چینایەتی، بەڵام ئەو کاتەی مارکیۆز دەکەوێتە ژێر کاریگەری فرۆید، بەو چاوە سەیری مێژووی مرۆڤایەتی دەکات، کە شارستانیەتێکی داپلۆسێنەرانە بەرێوەی دەبات.

مارکیۆز لە دەروازەی کتێبی (ئیرۆس و شارستانیەت)دا دەڵێ: ماوەیەکە ئەو بابەتەی فرۆیدم قبووڵکردووە، کەوا سەیری شارستانیەت دەکات، کە تێیدا هەمیشە ئارەزووەکانی مرۆڤ کۆنترۆڵ کراوە[٤٦].

ئەو بیرمەندە بەدوای مانایەکی دیکەی شارستانیەتدا وێڵە، کە جیاوازە لەو شارستانیەتەی لە کۆمەڵگای پیشەسازی و تەکنۆلۆژیدا هەیە، لەمەشدا پشت بە بۆچوونەکانی هێگڵ و مارکس و فرۆید دەبەستێت و پێشنیاری شارستانییەتێکی تر دەکات، کە مرۆڤ تێیدا مرۆڤایەتی خۆی دەدۆزێتەوە، ئەو ئازادییەش بەدەست دێنێ کە بە درێژایی مێژوو لێی قەدەغەکراوە.

مارکیۆز پێی وایە ئەگەر نەمانی داپلۆسین و سەرکوتکردن نموونەی بەرزی ئازادی بێ. ئەوا شارستانییەتی تێکۆشانە دژی ئەو ئازادییە[٤٧].

ئەو شارستانیەتەی لە دژی ئازادییە مانای کۆنی شارستانییەتە، کەواتە شارستانیەت بە مانا کۆنەکەی دژ بە فیکری ئازادی مرۆڤە لە هەموو بوارەکاندا، بەڵام لە مانای نوێی شارستانییەتدا مرۆڤ بە ئازادی راستەقینەی خۆی دەگات، کە شارستانی کۆن لێی زەوت کردبوو، لە کتێبی ئاماژە بۆکراو (ئیرۆس و شارستانی) مارکیۆز بە پشت بەستن بە تیۆری فرۆید هەوڵی دۆزینەوەی یۆتۆپیایەکی نوێ دەدات. دیارە تیۆری فرۆیدیش لەسەر ئەم گریمانە سەرەکییە دامەزراوە کە دەڵێت: سروشتی هەموو مرۆڤەکان وەك یەك وایە، ئەگەرچی ژینگەشیان جیاواز بێ، فرۆید پێیوایە کە پێویستی مرۆڤ لە ئاڵوگۆڕی تێرکردنی ئارەزووەکان، تەنیا لەناو کۆمەڵدا ئەنجام دەدرێ.

لێرەدا مارکیۆز تێزەکەی خۆی لەمەڕ پەیوەندی دیالیکتیکی ئیرۆس و شارستانی دەست پێدەکات، لە نێو تێرکردنی ئارەزووەکانیان و رژێمی دیاریکردن و دەگمەنی کە





بونیادێکی شارستانی دیاریکراو دەیچەسپێنێ جیاوازی هەیە، لەم نێوەندەدا نایەکسانی و ناتەبایی دێتە ئاراوە.

ئەم نایەکسانییە شێوازی ئیحیکارکردنێکی دەستکرد بۆ بابەتەکانی تێرکردنی ئارەزووەکانی مرۆڤ وەردەگرێ. ئەم شێوازە دروستکراوە مرۆڤ لەخۆ بەکەم زانین و داپلۆسین و سەرکوتکردن رزگار دەکات[٤٨].

مرۆڤ لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا بەم شێوەیە ئاراستە دەکرێت، کە هەموو ژیانی لە پێناو زیاکردنی بەرهەمدا خەرج بکات، ئەمەش بەرادەیەکی وا، کە نەتوانێ هیچ لەزەتێك لە ژیانی خۆی ببینێ. میکانیزمەکانی کۆمەڵگای هاوچەرخ بە تەواوی ژیانی مرۆڤ گەمارۆ دەدەن، بە هەموو شێوەیەك داوای زیاکردنی بەرهەمی لێدەکەن، پڕۆپاگەندەکان، پێداویستییەکانی مرۆڤ دیاری دەکەن نەك خودی خۆیان، بەرهەمهێنان بەشێوەیەکی عەقڵانی تەکینکی بەرێوەدەچێ و خەون و ئارەزووەکانی مرۆڤ بە تەواوی فەرامۆش دەکرێن. جا لەم نێوەندەدا مارکیۆز بەپشت بەستن بەتیۆر و بۆچوونەکانی فرۆید لە بەرانبەر شارستانیی پیشەسازی و عەقڵانی تەکینکیدا پێشنیاری شارستانییەتێکی دی دەکات، کە بریتییە لە شارستانی ئیرۆسی (Eros).

(ئیرۆس)یش واتا لەزەت و خۆشی سێکس، بەڵام ئەو بە چەمکێکی فراوانتر سەیری دەکات کە گەڕانەوە بۆ خودی زیندەگی مرۆڤ دەگەیەنێ، لە پێناو لەزەت و خۆشی وەرگرتن لە ژیان و بەکارهێنانی ئارەزووەکان شان بە شانی عەقڵ .

## پەراوێزەکان

١- ه.استیوارت هیوز ، هجرت اندیشه اجتماعی (١٩٣٠-١٩٦٥) ، ترجمهء عزت الله فولاوند، انتشارات طرح نو، چاپ اول -١٣٧٦- تهران، ص ١٩٩. هەروەها بڕوانە: د. قیس هادي احمد، الانسان المعاصر عند هربرت ماركيوز، بيروت ١٩٨٠، ص ١٥. علاء طاهر، مدرسة فرانكفورت من هوركهايمر الي هابرماز، منشورات مركز الانماء، القومي، بيروت، بدون سنة نشر، ص ٥٤-٥٥.

٢- علاء طاهر، مصدر سابق، ص ٦١.

٣- فرانتس نوییمان، لە ساڵی ١٩٠٠ لە شاری کاتوویتس Kattowitzی پۆڵۆنیا لە دایك و باوکێکی جوولەکە هاتۆتە دونیاوە، لە شاری فرانکفۆرت یاسای خوێندووە، لە ساڵی ١٩٢٧ لە شاری بەرلین نیشتەجێ بووە و خەریکی کاری پارێزەری بووە، ه. ستیورات هیوز لە بارەیەوە دەڵێت: (ئەگەر دیموکراسی لە ئەڵمانیادا بەرقەرار بووایە، نوێمان پلە و پایەکی سیاسی بەرچاوی دەبوو، چونکە ئەو لە ساڵانی کۆماری ڤایمار لە قوتابخانەی باڵای سیاسی دەرسی دەگوتەوە، هەروەها راوێژکاری یاسایی بوو لە حزبی سۆسیال دیموکرات، بەڵام هەر کە نازیزم دەسەڵاتی گرتە دەست لە ئەڵمانیا، نوێمان ناچار دەبێت وڵات بەجێ بهێڵێت) پاشان نوێمان لە لەندەن دەگیرسێتەوە و لە ژێر دەستی هارولد لسکی Harold Laski (١٨٩٣-١٩٥٠) خەریکی خوێندنی زانستی سیاسەت دەبێت، پاشان لە ساڵی ١٩٣٦ دەچێتە ئەمریکا، نوێمان کاتێك خەریکی کارکردن بوو لە کاروباری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، زیاتر حەزی لە دەرس گوتنەوە دەکرد، بەڵام دواتر لە زانکۆی کۆلۆمبیا دەبێتە مامۆستای سیاسەت، لە ساڵی ١٩٥٤ کۆچی دوایی کرد.

گرنگترین نووسینەکانی نویمان ئەمانەن: (چەمکی ئازادیی سیاسی) و (دەوڵەتی دیموکراسی و دەوڵەتی دەسەڵاتدار) (زانستە کۆمەڵایەتییەکان) و (مۆنتسکیۆ) و



(چەند نووسینێك دەربارەی دیکتاتۆری). بۆ زیاتر زانیاری بروانە: ه.استیوارت هیوز، هجرت اندیشه اجتماعی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٠-١٤٠.

٤- ه.استیوارت هیوز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٣.

٥- ه.استیوارت هیوز ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٥.

٦- هربرت ماركيوز، العقل و الثورة، هيجل و نشأة النظرية الاجتماعية، ترجمة د. فؤاد زكريا، بيروت الطبعة الثانية ١٩٧٩، ص ١٧.

٧- بول روبسون ، اليسار الفرويدي، ترجمة لطفى فطيم و شوقى جلال، مراجعة و تقديم: د. قدري حفني، بيروت ١٩٧٤، ص ١٢٥.

٨- محمود امين العالم ، ماركيوز او فلسفة الطريق المسدود، بيروت ١٩٧٢، ص ٨٢. هەروەها بڕوانە: د. قیس هادي احمد ، الانسان المعاصر عند هربرت ماركيوز، مصدر سابق، ص ٤٦.

٩- هربرت ماركوز، الماركسية السوفياتية، ترجمة جورج طرابيشي، طبعة ثانية منقحة، بيروت ١٩٧٣، ص ٥.

١٠- د. فؤاد زكريا ، هربرت ماركيوز، دار الفكر المعاصر للنشر و التوزيع، القاهرة — اغسطس ١٩٧٨ ، ص ٢٤٥، هەروەها بڕوانە: د. قیس هادي احمد ، الانسان المعاصر عند ماركيوز، مصدر سابق، ص ١٧، محمود امين العالم ، ماركيوز او فلسفة الطرق المسدود، مصدر سابق، ص ١٨٣.

١١- هربرت ماركوز ، الانسان ذو البعد الواحد، ترجمة جورج طرابيشي، بيروت الطبعة الثالثة ١٩٧٢، ص ١٥٦.

١٢- السدير ماكنتير ، ماركوز، ترجمة عدنان كيالي، بيروت ١٩٧٢، ص ١٥٦.

١٣- هربرت ماركوز ، الانسان ذو البعد الواحد، مصدر سابق، ص ٢٦٨.

١٤- جورج طرابيشي، الاستراتجية الطبقة الثورية، بيروت دار الطليعة، الطبعة الثانية ١٩٧٩، ص ١٩٤.

١٥- هەمان سەرچاوە پێشوو ل ١٩١.





١٦- مصطفى مرجان، د.محمد مخلوف، حركة مايو في فرنسا، منشور في مجلة المنار، شهرية سياسية فكرية عدد ٤١ مايو-ايار ١٩٨٨، ص ١٣٣.

١٧- د. فؤاد زكريا ، هيربرت ماركيوز،مصدر سابق، ص ١٧.

١٨- السدير ماكتيز، ماركوز، ، مصدر سابق، ص ٢٣.

١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤.

٢٠- علاء طاهر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٤-٥٥.

٢١- ه. ستيوارت هيوز ، سەرچاوەی پێشوو ، ص ١٩٩.

٢٢- علاء طاهر، سەر چاوەی پێشوو ، ل ٥٥.

٢٣- مارجوی جرين، هايدجر، ترجمة مجاهد عبدالمنعم مجاهد، بيروت ١٩٧٣، ص ١٩.

٢٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

٢٥- د. قيس هادي احمد ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.

٢٦- مارجوری جرين ، هەمان سەرچاوە، ل ٩.

٢٧- د. قيس هادي احمد ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

٢٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

٢٩- هربرت ماركوز ، العقل و الثورة، مصدر سابق، ص٦.

٣٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧.

٣١- د. قيس هادي احمد ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٨.

٣٢- هەمان سەرچاوەی پيشوو، ل ٢٤.

٣٣- هەمان سەرچاوەی پيشوو، ل٢٥.

٣٤- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٣٥-السدير ماكنتير، مصدر سابق، ص ٤٧.

٣٦- دكتر حسين بشيريه، تاريخ انديشەهاو جنبش های سیاسی در قرن بیستم، بخش هفتم، ماركسيسم انتقادى: ماركوزه و هابرماس، اطلاعاتى سياسى-اقتصادى، شماره ٧١-٧٢، سال هفتم/ مرداد وشهريور/١٣٧٢، ص ٢٦.






٣٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.

٣٨- الانسان المعاصر عند هربرت ماركيوز، ص ٢٥.

٣٩- لوسيان غولدمان، تأملات في فكر هربرت ماركوز، ترجمة جورج طرابيشى، منشور فى مجلة دراسات عربية،مجلة فكرية اقتصادية اجتماعية، العددان ٨-٩، السنة الثالثة عشر، حزيران، تموز،ص ص ( ١٤١-١٥٩) ص ١٤١.

٤٠- د. قيس هادي احمد ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١.

٤١- محمود امين العالم ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٢.

٤٢- هيربرت ماركيوز، الثورة و الثورة المضادة، ترجمة جورج طرابيشى، بيروت ١٩٧٣، ص ٤٢.

٤٣- هيربرت ماركوز، الماركسية السوفياتيية، مصدر سابق، ص ٢٤.

٤٤- د. فؤاد زكريا، هيربرت ماركيوز، مصدر سابق، ص ٥٦.

٤٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٦.

**لە میانەی ڕەخنەگرتنی ماركیۆز لە كۆمەڵگای ڕۆژئاوایی سەردەمی خۆیدا، بەهۆی زاڵبوونی چەندان شێوەی داپلۆسین و چەوساندنەوە و سەركوتكردن، نیتشە وزە وتوانایەكی گەورە بە ماركیۆز دەبەخشێت. بڕوانە: عوسمان یاسین، فریدریك نیتشە، دەزگای چاپ وبلاوكردنەوەی موكریانی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ٢٠٠٠، ل ١٨.**

٤٦- هيربرت ماركيوز، الحب و الحضارة، ترجمة مطاع صفدي، بيروت ١٩٧٠، ص ٣٩.

٤٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٩.

٤٨- مطاع صفدى ، اللاشعور بين السلوك والإجراء، منشور فى مجلة الفكر العربى المعاصر، مجلة العلوم الانسانية و الحضارية، العدد ٢٣، كانون الاول ١٩٨٢، كانونى الثاني ١٩٨٣، ص ١١.

# تەوەری دووەم

## چەمکی ماهیەت لە فەلسەفەی مارکیۆزدا

مارکیۆز لەمیانەی گرنگیدانی بە چەمکە فەلسەفییەکاندا، لێکۆڵینەوەییەکی تایبەتی دەربارەی چەمکی ماهیەت (Essence) نووسیوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە، پێش ئەوەی وەك بەشێك لە کتێبی (فەلسەفەی نەفی Negations- ١٩٦٨) بڵاوبێتەوە، پێشتر لە گۆڤارێکی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی بە زمانی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٣٦ بڵاوبوویەتەوە.

مارکیۆز لەم باسەیدا دەربارەی چەمکی ماهیەت، لە سەرەتادا ئەوە دەخاتە روو کە هەرچەندە هەندێك چەمکی فەلسەفی بە هۆی سیفەتی میتافیزیقییانەیان لە رەگ و ریشەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی فیکر دووردەکەونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم چەمکانە بەپێی پەرەسەندی مێژوو، گۆڕانکارییان بەسەر دادێت..[1].

مارکیۆز بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی خۆی، سەرەتای باسەکەی دەربارەی ماهییەت، لە روانگەی ئەفلاتۆنەوە (Plato- ٤٢٧ -٣٤٧پ.ز) باسی ماهییەت دەکات، دواتر بەپێی پەرەسەندنی مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوا ئەو گۆڕانکارییانە دەخاتەروو، کە بەسەر ئەم چەمکەدا هاتوون.

بەپێی بۆچوونی مارکیۆز لە مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوادا، لە لایەن ئەفلاتۆنەوە، بۆ یەکەم جار بەشێوەیەکی ئاشکراو روون چەمکی ماهییەت خراوەتەڕوو.

ماهییەت بریتییە لەو یەکێتییە سەرتاپاگیرییە جێگرەی بوون —الوجود- لە بەرامبەر فرەیەتی —التعددیە- ناجێگیر و گۆڕاوی بووندا، گرفتی فەلسەفییانەی چەمکی ماهییەت لەوەدایە، کە بوون هەر چەندە هەمەجۆرە و چەندان شێوەی هەیە، بەڵام وەك



یەك شت دەناسرێت، یەك شتی سەرتاپاگیر. لە راستیدا ئەم کێشەیە هەر تەنیا بەناسین- مەعریفەوە پەیوەست نییە.

مەسەلەی ماهیەتیش هەر تەنیا پەیوەندی بەمەعریفەوە نییە، لەبەر ئەوەی کاتێك وا سەیری بوون دەکرێت، کە یەك شتی هەمە جۆرە و زۆر شێوەی جیاجیای هەیە، ئەو کاتەش مەسەلەی رەخنەلێگرتن و ئەخلاق خۆیان دەخزێننە ناو باس و خواسی ماهییەتەوە[2].

بوونی راستەقینە ئەوە نییە کە ئێمە راستەوخۆ هەستی پێدەکەین، بەلکو ئەم جۆرە بوونە، بوونێکی ناتەواو ناجێگیرە.

جیاوازیکردن لە نێوان ماهییەت و رووالەت جیاوازیکردنە لە نێوان دوو جۆر بوون، بوونێك کە راستەقینەیە و جێگیرە و شایستەی ئەوەیە کە هەبێت، بوونێکی دیکە کە بەرەو لەناوچوون دەچێت و هەمیشە لە گۆڕاندایە، سیفەتی ئەم جۆرەیان هەر تەنیا ئەوەیە کە هەیە....[3]

ئەو بوونەی کە راستەوخۆ دەردەکەوێت و هەستی پێدەکەین، بوونێکی ناتەواوە، بەڵام ماهییەتی ئەو بوونە بریتییە لەو توانایەی کە لەمیانەی تێڕوانینێکی هەمەلایەنییەوە دەردەکەوێت، ئەو توانایەی کە هەوڵ و کۆشش دەکات بۆ ئەوەی ئامانجێك بهێنێتەدی. بەم پێیە چەمکی ماهییەت، هۆشیارییەکی رەخنەگرانە لە واقیعێکی نالەبار دەهێنێتەکایەوە، لەبەر ئەوەی ماهییەت وەك توانایەك- ئیمکان- دەبێتەوە هێزێك لەناو بووندا...

لای ئەفلاتۆن، ئایدیا (Eidos) حەقیقەتێکی جێگیر و نەگۆڕە، کە لەودیو ئەو دیاردە هەستپێکراوانەیە کە هەمیشە لە گۆڕاندان.

هەر چەندە مارکیۆز کاتێك باسی چەمکی ماهییەت دەکات، لە ئەفلاتۆنەوە دەست پێدەکات، بەڵام لە راستیدا فەیلەسوفە یۆنانییەکانی دیکەی پێش ئەفلاتۆن باسی ئەم مەسەلەیان کردووە. بۆ نموونە لای فساغۆرسییەکان ژمارە یاخود شێوازی ئەندازەیی





حەقیقەتی شتاکانە، ئەم جۆرە تەفسیرکردنە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ئەفلاتۆن هەبووە[٤].

هەندێك لە لێکۆڵەرەوانی فەلسەفەی یۆنان وای بۆ دەچن، کە هەوڵەکانی سوکرات (٤٧٠-٣٩٩ پ.ز) بۆ دیاریکردنی پێناسەیەکی جێگیر و نەگۆڕ بۆ بۆچوونە ئەخلاقییەکان، هەروەها گەڕان بەدوای ماهییەتی ئازایەتی یاخود دادپەروەری، بۆ گەیشتن بە حەقیقەتێکی جێگیر، سەرچاوەی تیوری ئایدیای ئەفلاتۆنن.

لێرەدا پرسیارە دەردەکەوێت کە ئاخۆ سوکرات خاوەنی ئەو تیۆرە ئایدیاییە بووە کە ئەفلاتۆن دەیخاتەڕوو؟

لە راستیدا بۆچوونەکانی سوکرات لەم بارەیەوە لە چوارچێوەیەکی ئەخلاقی دەرناچێت، بەڵام تیۆری ئایدیای ئەفلاتۆنی سەرجەم دیاردەکانی ئەخلاقی و سروشتی دەگرێتەوە[٥].

بەپێی بۆچوونەکانی مارکیۆز یەکەم شێوازی سروشتی رەخنەگرانە و دینامیکییانەی چەمکی ماهییەت لە گفتوگۆکانی (سوفستائیی و فیلیوس)ی ئەفلاتۆن بەرچاو دەکەوێت، لەم گفتوگۆیانەدا، ئایدیا — المثل —Eidos- وەك دینامیکییەتێك خۆی دەنوێنێت و خۆی دەخزێنێتە ناو ئەو پرۆسەیەی کە بوون وەك ئاکامێکی بەردەوامی — الصیرورە- ئەنجامی دەدات. ئەمەش یەکەم شێوازە کە تێدا بە تەواوی سروشتی رەخنەگرانە و دینامیکییانەی چەمکی ماهییەت دێتەدی[٦].

بیرۆکەی (ئایدیا) لای ئەفلاتۆن پێوەرێکە ئەو مەودایە دەپێوێت کە لە نێوان و واقیع و ئیمکاندا هەیە... ئەم بۆچوونەی ئەفلاتۆن هەڵوێستێکی رەخنەیی لێدەکەوێتەوە، ئەویش هەڵوێستی رەخنەگرتن لەو واقیعەی کە فەیلەسوفەکە تێیدا دەژیت[٧].

بەم جۆرە مارکیۆز دەیەوێت روویەکی شۆڕشگێڕانە بە فەلسەفەی ئەفلاتۆن ببەخشێت، لەبەر ئەوەی هەڵوێستی رەخنەگرانەی ئەفلاتۆن لەو جیهانەی تێیدا دەژیا هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانە بووە.



لای ئەفلاتۆن ئەو جیهانەی تێیدا دەژین، جیهانێکی راستەقینە نییە، بەڵکو جیهانێکی ناتەواوەوە لە گۆڕان دایە و بەرەو و لەناوچوون دەچێت، ئەو جیهانە بوونێکی راستەقینەی نییە، هەرچەندە راستەوخۆ هەستی پێدەکەین، بەڵام بوونی راستەقینە ئەوەیە کە ناڕاستەوخۆ دەتوانین هەستی پێبکەین، ئەویش جیهانێکی دیکەیە.. کە ماهییەتە، ئەو جیهانەی کە ئێمە راستەوخۆی هەستی پێدەکەین رووکەشەو لە گۆڕاندایە، بەڵام جیهانەکەی دیکە جێگر و نەگۆڕ و نەمرە، هەرگیز ناگۆڕێت و لەناو ناچێت... ئا ئەمەیە چوارچێوە گشتییەکەی فەلسەفە ئایدیالیزمییەکەی ئەفلاتۆن، کە مارکیۆز سەرسەختانە بەرگری لێدەکات لەبەر ئەوەی بیرۆکەی رەخنەیی تێدا زاڵە.

لە راستیدا ئەم جۆرە تەفسیرکردنەی فەلسەفە ئایدیالیزمییەکەی ئەفلاتۆن لەلایەن مارکیۆز، جێگای سەرنج و رەخنەیە، لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك نکۆڵی لەوە ناکات، کە هەر فەلسەفەیەك لە بەرامبەر جیهانێکی نالەبار و قەیرانئامێز جیهانێکی دیکەی لەبار و ئاسودە بە هیوا بخوازێت، ئەوا ئەو فەلسەفەیە ورژاندنێکی شۆڕشگێڕانەی تێدا بەدی دەکرێت، کە رەخنە لە واقیعێکی نالەبار دەگرێت بۆ ئەوەی گۆڕانکارییەك رووبدات، تاوەکو واقیعێکی دیکە بهێنێتەکایەوە، بەڵام دیارە هەڵوێستی رەخنەگرتن و رەفزکردنەوە کاتێك مۆرکی شۆڕشگێڕانەی لێ بەدی دەکرێت، ئەگەر بێت و وەك پێویست ئاراستەکەی دیار بکرێت، کە ئاخۆ رەخنە لە چ جۆرە واقیعێك دەگیرێت و چی پێشبینی دەکرێت؟

ئەگەر بێت و سەیری هەڵوێستی ئەفلاتۆن بکەین دەبینین، رەخنەی ئەو بیرمەندە لەسەردەمەکەی خۆی، بریتی بووە لە رەخنەگرتن لە دیموکراسی ئەسینا، لەبەر ئەوەی ئەفلاتۆن رق و کینەی لەو جۆرە واقیعە بوو کەئەم سیستەمە بەرێوەی دەبرد.

سیستەمێك خوازیاری گۆڕانکارییەکی هەمیشەیی بوو، ئەمەش لەگەڵ خەونەکانی فەیلەسوفێکی ئەریستۆکراتی وەك ئەفلاتۆن نەدەگونجا.

لەبەر ئەوەی ئەم فەیلەسوفە ئەریستۆکراتییە خەونی بە سیستەمێکی ئۆلگاریشی جێگیر و نەگۆڕ دەبینی.

جا لەبەر ئەوە ئایدیالیزمی ئەفلاتۆن لە بنچینەدا خوازیاری گۆڕانکاری و رەخنەگرتن نەبوو، بەڵکو دژی گۆڕانکاری و وەرچەرخان بووە، خوزایاری جیهانێکی سەقامگیربوو. بەم پێیە مارکیۆز هەڵوێستی خۆپارێزانەی فەلسەفەی ئەفلاتۆن بە تەواوی فەرامۆش کردووە، هاتووە سروشتێکی بە فەلسەفەی ئەفلاتۆن بەخشیوە، کە لە راستیدا ئەم فەلسەفەیە سیفەتێکی لەم جۆرەی نییە[٨].

مارکیۆز لەمیانەی خستنەڕووی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر چەمکی ماهییەتدا هاتووە لە فەلسەفەی رۆژئاوادا، باسی ئەو وەرچەرخانانە دەکات کە لەسەردەمی نوێدا بەسەر ئەم چەمکەدا هاتوون.

لای مارکیۆز لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە فەلسەفەی مەسیحیدا، چەمکی ماهییەت ئەو سروشتەی رەفزکردنەوە و رەخنەگرتنەی خۆی لە دەستدەدات، کە لەسەردەمی فەلسەفەی ئەفلاتۆن هەیبوو[٩].

لە فەلسەفەی قەشە تۆما ئەکوینی (١٢٢٥-١٢٧٤ ز) ماهییەت و بوون دووشتی لەیەکتر نەپچڕاون، ماهییەت لەناوەوە بوون پێکدەهێنێت.. واتە یەکبوون لە ئاردا هەیە، ئەویش خاوەنی ماهیەتی خۆیەتی.

ماهییەت کە بریتییە لە ماهییەتی بوون، خۆی لە خۆیدا بوونە، ماهییەت هەمیشە و لە هەموو حاڵەتێکدا لە ئارادایە. لای مارکیۆز هەر چەندە فەلسەفەی **تۆما ئەکوینی** لایەنی رەخنەی لە چەمکی ماهییەت کەمکردۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە بەردەوامی جەختی لەسەر ئەو جیاوازییەی نێوان ماهییەت و بوون کردووە، وەك نیشانەیەك، کە ئاماژە بۆ سیفەتێکی بەرچاوی خودی بوونەوەرەکان دەکات کە چۆن لە واقیعێکی شوێنکاتدا دەکەوێتە پێش چاوی مرۆڤ....[١٠]

لای مارکیۆز تاوەکو سەردەمی **دیکارت** گرفتی ماهییەت لە بوارەکانی لۆجیك و ئەبستمولوژیا شوێنی نەبووە و باسی لێوە نەکراوە. بەڵام لەسەردەستی **دیکارت** و پاشانیش **هۆسرەل**، لۆجیك و ئەبستمولۆژیا توختی گرفتی ماهییەت دەکەون[١١].





بەبۆچوونی مارکیۆز لە دوای سەدەکانی ناوەڕاست بە تایبەتی لەسەردەمی دیکارتەوە (١٥٩٦-١٥٩٧) تاوەکو سەردەمی ئەدمۆند هۆسرەل (١٨٥٩-١٩٣٨) لە فەلسەفەی رۆژئاوادا ماهییەت گۆڕانکارییەکی دیکەی بەسەردا دێت.

دیکارت باسی هێزێکی شاراوەی نامرۆڤانە دەکات، هێزی بازاڕ و کارکردن، ئەو هێزە وادەکات تاك ماهییەت بگەڕێنێتەوە بۆ خودی خۆی، بەرادەیەك کە تاك هەر تەنیا خودی خۆی دەبینی جێگیر و نەگۆڕ لەناو جیهانێك کە ناتواندرێت دەست بەسەر وەرچەرخانەکانیدا دابگیردرێت. بەم پێیە ماهییەت بریتییە لە ماهییەتی خودی تاکی بیرکەرەوە [١٢]، من واخۆم دەناسم کە بوونەوەرێکم تەنیا ماهییەتم لەوەدایە کە من بیر دەکەمەوە ، کەواتە چەمکی ماهیەت لای دیکارت لە کۆجیتۆکەیدایە[١٣] .

بەڵام لای هێگڵ پەیوەندییەکی دیالیکتیکیانە لە نێوان ماهییەت و رووالەتدا هەیە، لەبەر ئەوە مارکیۆز لەم بارەیەوە دەڵێت: رووالەت و جەوهەر (ماهیەت) لای هێگڵ دوو حاڵەتی (وجود) بوونن، کە پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕکارییانەیان لە نێواندا هەیە.. ماهیەت تەنیا لە میانەی رووالەتەوە دەردەکەوێت[١٤].

هەرچەندە بۆچوونی هێگڵ لەمەڕ ماهییەت هەندێ رەگەزی مێژووییانەی تێدەکەوێت، بەڵام لە راستیدا کاریگەرییەکی راستەقینەیان نییە، لەبەر ئەوەی ماهییەت لای هێگڵ جوولەیە، بەڵام جوولەیەکە هیچ گۆڕانکارییەی کرداری تێدا روونەدات، لەبەر ئەوە ماهیەت جولەیەکە لە ناوەوەی خۆیدا روودەدات، واتە پرۆسەیەکە لە خودی خۆیدا ئەنجام دەدرێت، هیچ پەیوەندییەکی بەدەرەوەی خۆی نییە.

لای مارکیۆز چەمکی ماهییەت لە فەلسەفەی فینومینۆلۆجیای هۆسرەل سروشتی رەخنەییانەی خۆی لەدەست دەدات. لەبەر ئەوەی فینۆمینۆلۆجیا —**الظاهراتیة**- دەیەوێت لە دەرەوەی شوێنکاتدا بگاتە ماهییەتی شتەکان، ئەم فەلسەفەیە سەرەتا بەوە دەست پێدەکات کە چ لەواقیعدا هەیە، هەروەك مارکیۆز دەڵێت: ئەمەش وای لێدەکات کە دەستبەرداری ئەو بۆچوونەبێت، کە دەڵێت ناکۆکییەکی بنچینەیی لە نێوان واقیع و

ئیمکاندا (ئەوەی دەشێت ببێت) هەیە. ئیمکان لای هۆسرەل هەمان ئەو واقیعەیە کە هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە دارێژراەتەوە[١٥].

مارکیۆز دەڵێت: فینۆمینۆلۆجیای هۆسرەل فەلسەفەیەکی وەسفییە، بۆ دەرخستنی ئەوەی کە دەشێت یاخود دەبێت ئەو شتە بە جۆرێکی دیکە بێت، هیچ ئامانجێکی دیکە نییە، جگە لەوەی کە وەسفی ئەو شتە بکات کە دیار و لەبەرچاوە، کاتێك فینۆمینۆلۆجیا بەشێوەیەکی رادیکالییانە بانگەشەی (گەڕانەوە بۆ خودی شتەکان) دەکات، سروشتێکی یاخود سیفەتێکی جێگیری و نەگۆڕی، هەروەها ئیجابی (پۆزێتیڤی)یانەی خۆی ئاشکرا دەکات[١٦].

مارکیۆز کاریگەری فەلسەفەی پۆزێتیڤیزمی —**الوضعیة**— لە سەر فینۆمینۆلۆجیای هۆسرەل دیار دەکات، هەروەها رەخنەگرتنیشی لە هۆسرەل لە هەمان ئەو دیدوبۆچوونانەوە سەرچاوە دەگرێت کە سەبارەت بە فەلسەفەی پۆزێتیڤیزم هەیەتی.

جا ئەگەر فەلسەفەی پۆزێتیڤیزم Positivism لای مارکیۆز عەقڵی کردبێتە هێزێکی خۆپارێزانە، ئەمەش پێچەوانەی فەلسەفەی هێگڵە کە عەقڵ لای هێزێکی شۆڕشگێڕانە بوو، دیارە بەپێی ئاراستەکانی بەکارهێنانی عەقڵ، ئاکامەکان دەکەونەوە. لە فەلسەفەی پۆزێتیڤیزمدا عەقڵ هەڵوێستێکی ئیجابیانە لەبەرامبەر واقیعدا وەردەگرێت.

فەلسەفەی پۆزێتیڤیزم لە جیاتی ئەوەی رەخنە لە واقیع بگرێت و هەوڵی گۆڕینی بدات، هەر تەنیا بەوەسفکردنی دەوەستێت، نەك هەر ئەوەندە، بگرە پشتگیری لە واقیعی باو دەکات و دژی هەر گۆڕانکاری و وەرچەرخانێك دەبێت کە دەشێت رووبدات[١٧].

لێرەدا فەلسەفە نێگێتڤیزمەکەی مارکیۆز کە رێك پێچەوانەی فەلسەفەی پۆزێتیڤیزمە، رەخنەکانی خۆی دەست پێدەکات، لە پێناو گۆڕینی واقیع و هێنانەکایەوەی یۆتۆپیا... مارکیۆز دەڵێت: بیرکردنەوە لە ناکۆکییەکان دەبێت توانایەکی زۆری نەفیکردنی هەبێت و زۆر یۆتۆپاوییانە دژی بارودۆخی باو بوەستێت[١٨].



کاتێك مارکیۆز دەربارەی چەمکی ماهیەت لە فەلسەفەی فینۆمینۆلۆجیای هۆسرەل دەدوێت، رەخنەی مارکیۆز لە هۆسرەل لەم بارەیەوە لەوەتێ ناپەڕێنێت کە ناوبراو بە فەیلەسوفێکی پۆزەتیڤیزمی تاوانباری دەکات. هەر ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بە فەیلەسوفێکی کۆنەپەرست لە قەڵەمی بدات.

ئەوەی کە جێگای سەرنجە لێرەدا ئەوەیە کە فەلسەفەی هۆسرەل لەبەر ئەوە فەلسەفەیەکی کۆنەپەرست نییە، کە سیفەتی واقیعی یاخود پۆزتیڤیزمی هەیە. بەڵکو بەپێچەوانەوەیە. هۆکاری سەرەکی کۆنەپەرستی فەلسەفەی **هۆسرەل** لەوەدایە کە کەوتۆتە تەڵەی فەلسەفەی (ئایدیالیزمی خودی) —المثالیة الذاتیة-. لەبەر ئەوەی هۆسرەل لەگەڵ دیکارت بانگەشەی کۆجیتۆی دەکرد و زۆر توندڕەوانە بەرگری لە عەقڵخوازی زێدەڕۆییانە — العقلانیة المتطرفة- دەکرد و لە رەوتی فەلسەفەی ئەزمونگەری بە تەواوی دوورکەوتبۆوە.

لە فەلسەفەی ئایدیالیزمیدا لە دەرەوەی زەمەن سەیری ماهییەت دەکرێت یاخود ماهییەت لە فەلسەفەی ئایدیالیزمدا زیاتر وەك حاڵەتێك یاخود سیفەتێکی بوون دەخرێتە روو کە لە رابردوودا لە ئارادا بووە، هەروەك چۆن لای **ئەرستۆ** ماهییەت ئەو حاڵەتەیە کە لە رابردوودا بوون بەخۆوەی دەگرێت و بەرەو رابردوو ئاراستە دەکرێت، بەڵام لە فەلسەفەی مەتریالیزمیدا بە پێچەوانەوە. ماهییەت بەرەو دوا رۆژ ئاراستە دەکرێت، لەبەر ئەوەی فەلسەفەی مەتریالیزمی لە دەرەوەی زەمەن سەیری ماهییەت ناکات، بەڵکو لە چوارچێوەی زەمەن-مێژوودا باسی لە ماهییەت دەکات، لەبەر ئەوە مارکیۆز دەڵێت: تێگەیشتنی مەتریالیزمی بۆ ماهییەت تێگەیشتنی مێژووییانەیە[١٩].

بەپێی فەلسەفەی مەتریالیزم، ماهییەت لە مومارەسەکردندا دەردەکەوێت، ئەمەش پێچەوانەی تێڕوانینی ئایدیالیزمییانەیە لەمەڕ چەمکی ماهییەت، کە هیچ گرنگی بە مومارەسەکردن نادات.

لە فەلسەفەی مەتریالیزمی دیالکتیکدا ماهییەت ئەو پەیوەندییە ناوکییانەیە، کە لە جیهانی بابەتیدا لە ئارادان و بنچینەی دیاردەکان پێك دەهێنن. دیاردە یاخود





رووالّەت، بریتییە لەو ماهییەتەی کە لە حالّەتی دەرکەوتن دایە، یاخود رووالّەت بریتییە لە دەرەوەی ماهییەت[٢٠].

بەم پێیە ماهییەت و رووالّەت هەردووکیان تەواوکەری یەکترن و هیچیێکیان بەبێ ئەوی دیکە بوونی نییە، بەڵکو هەردووکیان رەنگدانەوەی لایەنە جیاجیاکانی واقیعێکن، ماهییەت رەنگدانەوەی لایەنی ناوەوەیە، رووالّەت یاخود دیاردە رەنگدانەوەی رووی دەرەوەی هەمان واقیعەکەیە.

ئەم پەیوەندییەی نێوان ماهییەت و رووالّەت ئەوە ناگەیەنێت کە هەمیشە لە روالّەتەکان ماهییەتەکان دەدۆزینەوە، لەبەر ئەوە نابێت وای بۆ بچین کە یەکێتی ماهییەت و رووالّەت بریتییە لە یەکێتیەکی گونجاو، لەبەر ئەوەی ئەگەر وابووایە ئەو کات زۆر بە ئاسانی دەتوانرا یاساکانی پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵگا بدۆزینەوە، بەڵام دیارە ناسینی ماهییەتی دیاردەکان پێویستی بە هەوڵ و کۆششی زۆر هەیە، ئەم هەوڵ و کۆششە بۆ دۆزینەوەی ماهییەتی دیاردەکان لە فەلسەفەی مەتریالیزمی دیالکتیکدا پشت بە مومارەسەکردن (براکسیس) دەبەستێت.

فەلسەفەی مەتریالیزمی رەخنە لە فەلسەفەی ئایدیالیزمی دەگرێت، کاتێك ماهییەت لە دیاردەکات جیادەکاتەوە، بە تایبەتیش رەخنە لە فەلسەفەی کانت دەگرێت کە جیهان بۆ دووبەش دابەش دەکات، جیهانی دیارەکان —Phenomemen- فینۆمەن، کە دەشێت بە هۆی هەستەکانمانەوە بیانناسین، بەڵام جیهانی ماهییەت نۆمەن —Noumene- یاخود جیهانی شتەکان لە خودی خۆیاندا ناتواندرێت بە هۆی هەستەکانمانەوە بیانناسین.

بەپێی بۆچوونی مارکیۆز فەلسەفەی مەتریالیزمی دیالکتیك توانایەکی نوێی رەخنەگرتنی بە تیۆری ماهییەت بەخشی، لەبەر ئەوەی ململانێی نێوان واقیع و ئیمکان خالّێکی سەرەکی دینامیکی ئەو تیۆرەیە[٢١].

لە فەلسەفە مەتریالیزمی دیالکتیکدا، بوون و بونیادێکی جێگیر و نەگۆری نییە، بەڵکو بەپێی ئەم فەلسەفەیە لە میانەی پەیوەندی مێژووییەوە، بە هۆی





مومارەسەکردنێکی عەقلانییەوە خەڵك دەتوانن ژیانی خۆیان بگۆڕن، بە هۆی مومارەسەکردنێکی عەقلانییەوە خەڵك دەتوانن لەو بارودۆخەی کە تێیدان تێپەڕینن و واقیعێکی دیکە بهێننەکایەوە.

ئەو ململانێ و دژایەتیکردنەی لە نێوان ئیمکان و واقیعدا هەیە، مەعریفە هاندەدات بۆ ئەوەی بێتە بەشێك لە مومارەسەکردنی گۆڕاندا، لەبەر ئەوەی رووالّەت لەگەڵ ماهییەتدا راستەوخۆ یەك ناگرنەوە، هەروەها هێنانەکایەوەی واقیعێکی دیکەی لەبار و گونجاو کارێکی ئاسان نییە، هەڵوێستی تایبەتی و گشتی، رێکەوت و زەرورەت لە ململانێیەکاندا جیهان بەرێوە دەبەن، جا لەم بارودۆخانەدا دەرفەت بۆ مومارەسەکردنێکی عەقلانییانەی مرۆڤ دەرەخسێت[٢٢].

فەلسەفەی مەتریالیزمی، گرفتی ماهییەت بەپیادەکردنی کۆمەڵایەتی دەبەستێتەوە، ئەمەش وادەکات، دووبارە چەمکی ماهییەت بەشێوەیەکی وادابرێژرێتەوە کە پەیوەندی بە هەموو چەمکەکانی دیکەدا هەبێت، ئەویش لە پێناو ئاراستەکردنی بەرەو ماهییەتی مرۆڤ[٢٣].

جا لەبەر ئەوەی مرۆڤ دەبێتە خالّی سەرەکی لە تیۆری ماهییەت، مرۆڤیش بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە، لەبەر ئەوە مارکیۆز تێگەیشتنی مەتریالیزمی بۆ ماهییەت بە تێگەیشتنی مێژوویی دادەنێت.

مرۆڤ ماهییەتی خۆی لە کۆمەڵگای چینایەتیدا ون دەکات، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئازادی راستەقینەی خۆی لە دەست دەدات، کە کرۆکی ماهییەتی پێکدەهێنێت.

لە میانەی مومارەسەکردنی شۆڕشگێڕانەدا مرۆڤ دەتوانێت واقیعێکی دیکە بهێنێتەکایەوە و بەسەر ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای چینایەتیدا زاڵ ببێت، ئەو کۆمەڵگایەی کە مرۆڤ تێیدا نامۆیە و ئازادی راستەقینەی لێ زەوت کراوە، ئەو کۆمەڵگایەی کە تێیدا یاسای کار و سەرمایە ژیان بەرێوەدەبات، بە هۆی مومارەسەکردنێکی شۆڕشگێڕانە مرۆڤ دەتوانێت واقیعێکی لەبارتر بهێنێتەکایەوە و ماهییەتی راستەقینەی خۆی بەدەست بهێنێتەوە.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- هربرت ماركوز ، فلسفة النفی ، دراسات فی النظرية النقدية، ترجمة مجاهد عبدالمنعم مجاهد، منشورات دار الاداب، بيروت ، الطبعة الاولى، مايو ١٩٧١ ، ص ٥٦.

٢- هەمان سەرچاوە، ل ٥٨.

٣- د. فؤاد زكريا ، هربرت ماركيوز، دار فكر المعاصر للنشر و التوزيع، القاهرة اغسطس ١٩٧٨ ، ص ١٩.

٤- د.اميرة حلمی مطر، الفلسفة عند اليونان ، كلية الاداب جامعة القاهرة، دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٧٤ ، ص ٦٩.

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٠.

٦- هربرت ماركوز ، فلسفة النفي، مصدر سابق، ص ٥٩.

٧- د. فؤاد زكريا، مصدرسابق، ص ٢٠.

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١.

٩- هربرت ماركوز ، فلسفة النقي، مصدر سابق، ص ٥٩.

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠.

١١- هەمان سەرچاوە و لاپەرە ی پێشوو.

١٢- د. فؤاد زكريا، سەرچاوەی پێشوو. ل ٢٢.

١٣- بە پێی کۆجیتۆی دیکارت، من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم، لێرەدا مارکیۆز دەڵێت: دوای ئەوەی دیکارت ماهیەتی مرۆڤی بە بیرکردنەوە بەستەوە، گرفتی ماهیەت کەوتە بواری خودی بیرکردنەوە. بڕوانە: هربرت ماركوز ، فلسفة النفي، مصدر سابق، ص٦٤.

١٤- - هربرت ماركوز ، فلسفة النفي، مصدر سابق، ص ٧٩.





١٥- د. فوادزکریا، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤، هەروەها بڕوانە السدير ماكنتير، ماركوز ، ترجمة عدنان كيالی بيروت ، الطبعة الثانية اب ١٩٧٢ ص ١٢-١٤.

١٦- هربرت ماركوز ، فلسفة النفي، مصدر سابق، ص ٧٢.

١٧- د. قيس هادی احمد ، الانسان المعاصر عند هربرت ماركيوز، بيروت ١٩٨٠، ص ٧٠.

١٨- هربرت ماركوز ، فلسفة النفي، مصدر سابق، ص ١٢.

١٩- هربرت ماركوز ، فلسفة النفي، مصدر سابق، ص ٨٦.

٢٠- فاسيلى بودو ستنيك ، اوفشی ياخوت، الف باء المادية الجدلية، ترجمة: جورج طرابيشی، دار الطليعة بيروت، الطبعة الاولى ١٩٧٩ ، ص ٩٦.

٢١- هربرت ماركوز ، فلسفة النفي، مصدر سابق، ص ٨١.

٢٢- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣.

## دەستپێك

ئەگەر مەبەست لە باسکردنی هەر بیرمەندێك خستنەڕووی ئەزموون و سەرنجەکانی ئەو بیرمەندەبێت، شان بە شانی ئەوەی کە کاریگەری ئەو بیرمەندە لەسەر رەوتی بیرکردنەوەی سەردەمی ژیانی خۆیدا هەڵبسەنگێنین، دیارە ئەو کاتە ناچار دەبین لە میانەی باسکردنی ئەو بیرمەندە لە شێوازی ژیننامەی (**السيرة الذاتية**) ئەو بیرمەندە تێپەڕێنین، چونکە لەوانەیە باسکردنی ژیاننامەی بیرمەندێك یاخود هەر نووسەرێك کۆمەڵە زانیارێکی رووتمان بدەنە دەست، بەڵام هەرگیز نامانگەیێنێتە قووڵایی سەرنج و بیروبۆچوونەکانی ئەو بیرمەند و نووسەرانەی کە باسیان لێوە دەکەین. لەبەر ئەوە هەوڵدەدەین لە میانەی باسکردنی بیروبۆچوونەکانی بیرمەندی گەورەی سەدەی بیستەم جۆرج لۆکاش بە سوودوەرگرتن لە ژیاننامە و مێژووی بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی، سەرنجێکی هەمەلایەن لەمەڕ فەلسەفەی ئەو بیرمەندە بخەینەڕوو.

دوای ئەوەی بە دەروازەیەك لەم بەشەی باسەکەماندا دەستپێدەکەین، لە میانەی دوو تەوەردا ، باسی ژیان و بەرهەمەکانی لۆکاش و ئەوهزرمەندانە دەکەین کە کاریگەرییان لەسەر بیروبۆچونەکانیدا هەبووە، پاشان باسی لۆکاش لە لە نێوان سیاسەت و ئیستاتیکا دەکەین.

لە کۆتایشدا هەوڵی ئەوە دەدەین دەرەنجامی سەرنجە هەمەلایەنەکانمان لەمەڕ ئەو بیرمەندە چڕبکەینەوە.



## دەروازە

جۆرج لۆکاش لەناو فیکری رۆژئاوایی و جیهانیدا شوێنێکی بەرچاو و روونی هەیە، ئەم بیرمەندە لە بیرکردنەوە و نووسینەکانیدا خاوەن رێڕەوی تایبەتی خۆیەتی، هەروەك چۆن لە میانی خستنەڕووی بەرهەمەکانیدا بۆمان دەردەکەوێت، زیاتر بواری ئیستاتیکای هەڵبژاردووە و بە تایبەتیش کە توخنی رۆمان کەوتووە، وەك ژانرێکی ئەدەبی دانسقە سەیری کردووە و لەم بارەیەوە بەسوودوەرگرتن لە تێڕوانییە ئێستاتیکییەکانی هێگڵ بۆتە خاوەنی تیۆری تایبەی خۆی، هەر چەندە لۆکاش گرنگییەکی زۆری بە بواری تیۆری فیکری و ئیستاتیکی داوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیشدا گۆشەگیرنەبووە، بەڵکو بەشداری لە چالاکییەکانی سیاسییەکان و کاروباری دەوڵەت کردووە و پلە و پایەی کارگێڕی و سیاسی و ئەکادیمیشی وەرگرتووە.

لە راستیدا لۆکاش هەروەکو ئەو بیرمەندە رەسەنانەی کە بە سادەییەوە تەسلیمی واقیع نابن و چۆك دانادەن، ئەویش بە سادەییەوە خۆی نەداوەتە دەست ئەو عفریتەی کە پێی دەگوترێت دەسەڵاتی سیاسی، هەرچەندە پلە و پایەی وەزیری وەرگرتووە و بەشداری لە دەسەڵاتی سیاسیش کردووە، بەڵام بێ ئۆقرەیی ئەو بیرمەندە لە بەرامبەر بۆچوونی وەستاو و نەگۆڕ و دۆگمادا، پاڵی پێوەناوە کە هەمیشە لە خۆنوێکردنەوەدابێت. ئەمەش وای کردووە کە ئەم بیرمەندە زۆر لێکدانەوەی جیاجیای بۆ بکرێت، لەبەر ئەوەشە دەبینین جۆرج لۆکاش بە شێوەی جۆراوجۆر لە لای بیرمەندانەوە باسدەکرێت، بۆ نموونە بارکنسون وای بۆ دەچێت کە لۆکاش نوێنەرایەتی شەپۆلی مارکسیزمی نوێ دەکات، بەڵام لای **جۆرج لختهایم**، جۆرج لۆکاش نوێنەرایەتی هێگڵیزمی نوێ دەکات(1). کەچی **فیکتۆر زیتا** بە ریڤۆژینیستی دادەنێت، بەڵام لوسیان گۆڵدمان کە زۆر لە ژێر کاریگەری لۆکاش دابووە دەیەوێت لێکدانەوەیەکی وجودییانەی ئەو بیرمەند بکات(2).





## تەوەری یەکەم
## ژیان و بەرهەمەکانی لۆکاش و
## کاریگەری هزرمەندان بە سەریەوە

جۆرجی سزیجدی فون لۆکاش (Gyorgy Szegdy Von Lukacs) لە بەراوری ١٣ نیسانی ساڵی ١٨٨٥ لە شاری بۆداست لە دایکبووە، باوکی سەرۆکی بانکی مەڵبەندی هەنگاریا بووە، لۆکاش کوڕی دووەمی[٣] خێزانەکەی بووە کە بە خێزانێکی جوولەکەی دەوڵەمەندی هەنگاریا-مەجەر لە قەڵەم دەدرا، باوکی لۆکاش بە هۆی ئەو خزمەتەی کە لە بواری ئابووری و بانکیدا پێشکەشی کردبوو نازناوی ڤۆن (Von) یان پێبەخشیبوو، باوکی دەیویست کوڕەکەی لە ژیانیدا هەمان ڕێچکەی ئەو بگرێت، بەڵام لۆکاش هەر لە منداڵیدا حەزی لەوە دەکرد ببێتە شاعیر یاخود نووسەرێکی شانۆیی، هەر لە منداڵییەوە خولیای خۆی بۆ ئەدەب دەرخست و لە بواری ڕەخنەدا زۆر بەهرەمەندبوو. سەرەتای نووسینی لۆکاش بۆ ساڵی ١٩٠٢ دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەی هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە بیست ساڵان، زۆر چالاکانە بەشداری چالاکی فیکری شارەکەی دەکرد، ئەوە بوو لەو تەمەنەدا بووە ئەندامی (یانەی قوتابیانی سۆسیالیست)، ئەم یانەیە بە بیرمەندی مەجەری ئارفن زابو (١٨٧٧-١٩١٨) دامەزراندبوو.

زابو لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی نیتشە و مارکس دابوو، لەساڵانی ١٨٩٩-١٩٠٣ مێژووی لە زانکۆی ڤیەنا خوێندبوو، بەرهەمەکانی مارکس و ئەنگلزی وەرگێرابووە سەر زمانی مەجەری، دواتر لەگەڵ لۆکاشدا گۆڤاری (سەدەی بیستەم)یان دەرکرد[٤].

هەر لە سەرەتای پەیوەندیکردنی لۆکاش بەو یانەی کە زابو دامەزراندبوو، سەرەتای دژایەتیکردنی ڕژێمی سەرمایەداری لە فیکری لۆکاشدا نەشونمایکرد،





ئەمەش لای زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەو کات دەنگدانەوەیەکی ئاسایی بوو، بە تایبەت لە ئەڵمانیا کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەڵومەرجێکی ڕۆمانسییانە دژی سەرمایەداری لە لایەن ڕۆشنبیرانی ئەو کاتە لە ئارادابوو، ئەو کاتەی کە ڕۆشنبیران هەستیان بەوە دەکرد چەوساندنەوەی مرۆڤ لە ژێر سیستەمی سەرمایەداریدا لە زیادبوونێکی رادەبەدەردایە، لە سایەی ئەو سیستەمەدا مرۆڤ وەك کەرەستە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، لەبەر ئەوەی لای ڕۆشنبیران ئەو بیرۆکەیە لە ئارادابوو، کە دەبوایە و پێویست بوو چاکسازییەکی ئەخلاقی ئەنجام بدرێت، ئەم بیروبۆچوونە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە لاپەڕەکانی گۆڤاری (سەدەی بیستەم)، بەرچاو دەکەوت، کە لۆکاش لە ساڵی ١٩٠٦ تاوەکو ١٩١٨ بەشداری لە بڵاوکردنەوەی دەکرد.

لۆکاش لە نێوان ساڵانی ١٩٠٢ تا ١٩٠٦ لە زانکۆی بۆداپست دەیخوێند و دواتر بڕوانامەی دکتۆرای لە فەلسەفە بەدەستهێنا، لەم ماوەیەدا چەند شانۆگەرییەکی بۆ تیپێکی شانۆیی نووسی، ئەندامانی ئەو تیپە شانۆییە دەیانویست شانۆیەکی نوێ دابمەزرێنن کە تەعبیر لە خواستەکانی چینی کرێکار بکات، یەکەمین نووسینی تیۆری لۆکاش کە لەو ماوەیەدا نووسی بەناونیشانی (مێژووی پەرەسەندنی دراما) بوو، ئەم بەرهەمەی لۆکاش نزیکەی هەزار لاپەڕە دەبوو[٥] کە لە ساڵی ١٩٠٨دا بڵاوکرایەوە. لۆکاش لەم کتێبەیدا بە ئاشکرا کاریگەری کانتیزمی نوێی بەسەرەوە دیاربوو. هەر لەو ماوەیەدا چەند وتارێکی لە گۆڤاری (Wesf) بڵاوکردەوە کە دواتر لەگەڵ هەندێ نووسینی دیکەیدا لە کتێبێك بە ناونیشانی (ڕوح و فۆرمەکان) بڵاوبوونەوە.

هەر لەو کاتەدا واتە ساڵی ١٩٠٨، لۆکاش زۆر بەدەگمەن نەبوایە بە زمانی هەنگاری-مەجەری نەیدەنووسی، بەڵکو زۆربەی نووسینەکانی دواتری بە زمانی ئەڵمانی بوون. لە ڕاستیدا تا ئەو کاتە لۆکاش لەگەڵ ژیانی سیاسیدا بەشێوەیەکی ڕاستەقینە تێکەڵ نەببوو، بەڵکو زیاتر گرنگی بە فەلسەفە و کۆمەڵناسی و ئیستاتیکا دەدا، بەڵام لە هەموویان زیاتر گرنگی بە ئیستاتیکا دەدا، لەبەر ئەوە

دەبینین بەرهەمەکانی ئەو ماوەیەی زیاتر دەربارەی رەخنەی ئەدەبی و ئیستاتیکا بوونە.

لە ساڵی ١٩٠٩ لۆکاش چووە ئەڵمانیا و لە زانکۆی بەرلین بووە قوتابی جۆرج سیمل (Georg Simmel) (١٨٥٨-١٩١٨)[٦] ، لۆکاش زۆر بە پەرۆشەوە گوێی بۆ لێکچەرەکانی مامۆستاکەی شل دەکرد، ئەمەش وایکرد کە بکەوێتە ژێر کاریگەری بیروبۆچوونەکانی کانتزمی نوێ –نیوکانیتزم. ئەوانەی باوەڕیان بەو رێبازە فەلسەفییە هەبوو جەختیان لەسەر جیاوازی نێوان تیۆری مەعریفە و میتافیزیقیای تەئەمولی دەکرد، نکۆڵییان لەوە دەکرد کە بتواندرێت بەشێوەیەکی حەقیقی دەرك بە واقیعی بەرجەستەکراو بکرێت.

لۆکاش کتێبی (روح و فۆرمەکان)ی لە ساڵی ١٩١٠ لە مەجەر و لە ساڵی ١٩١١ لە ئەڵمانیادا بڵاوکردووە، لوسیان گۆڵدمان ئەم کتێبەی لۆکاش بە بنچینەی دامەزراندنی فەلسەفەی ئگزیستانسیالیسم دادەنێت[٧]. هەر بە هۆی ئەم بۆچوونەشیەوە گۆڵدمان دەیەوێت لێکدانەوەیەکی وجوودینانە بۆ فەلسەفەی لۆکاش بکات. لە راستیدا ئەم کتێبە (روح و فۆرمەکان) کاریگەری لەسەر زۆربەی بیرمەندانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم هەبووە، لەوانەش بەسەر ئەدرنۆ.

لە وتارێکی ئەم کتێبەدا لۆکاش سەرنجی ئەڵمانیاییەکان بۆ فەلسەفەی کیرکگارد رادەکێشێت. لۆکاش خۆی لە بارەی پەرەوەردەی فیکری ئەو کاتەی خۆی دەڵێت: کە قوتابی بووم هەندێ نووسینی مارکسم خوێندبۆوە، دواتر لە ساڵی ١٩٠٨ توخنی خوێندنەوەی کەپیتاڵ کەوتم و بۆ ئەوەی بنچینەیەکی کۆمەڵایەتی ببەخشمە وتارەکانم کە لە مەڕ مەرگەساتەکانی سەردەم دەمنووسین، چونکە سەبارەت بە مارکس ئەوە لای من گرنگ بوو کە زانایەکی کۆمەڵناسی بوو، کە لە میانەی بۆچوون و میتۆدییەکانی سمیل و ماکس ڤیبەر سەیرم دەکرد، لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی گەڕامەوە سەرخوێندنەوەی مارکس، بەلام ئەمجارەیان لە چوارچێوەی گرنگی پێدانێکی فەلسەفی گشتییەوە بوو، ئەو کات من لە ژێر





کاریگەری بیروبۆچوونە فەلسەفییە باوەکان دابووم، نەك هی بیرمەندە هاوچەرخەکان، بەڵکو بیروبۆچوونەکانی هێگڵ، بە راستی کاریگەری هێگڵ بەسەرمەوە ئاڵۆزبوو، ئەمە لە لایەك لە لایەکی دیکەوە کیرکگارد لە سەردەمی لاویمدا رۆڵێکی گەورەی لەسەر پەرەسەندی بیرم هەبوو، لە ساڵەکانی کۆتایی شەڕیش (هیدلیرج) ئەو کاریگەرییەی هەبوو[٨] .

هنری ئارفون لە کتێبەکەیدا لەسەر لۆکاش ژیاننامەی ئەو بیرمەندەی بۆ پێنج قۆناغ دابەشکردووە، بەم شێوەیەی خوارەوە[٩]:

قۆناغی یەکەم : ئەم قۆناغە دەکەوێتە نێوان سالانی ١٩٠٧ تاوەکو ساڵی ١٩١٤، لەم قۆناغەدا لۆکاش لە ژێر کاریگەری نیوکانتیزم و فەلسەفەی ژیانی دلتای و فینۆمینولۆجیای هۆسرەل دابوو، بەنێوبانگترین کتێبی ئەم قۆناغەیشی بریتی بوو لە (روح و فۆرمەکان).

قۆناغی دووەم: ئەم قۆناغە لە ساڵی ١٩١٤ تاوەکو ساڵی ١٩٢٤ دەست پێدەکات، لەم قۆناغەدا لۆکاش لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی هێگڵیزمیدایە و کاریگەرییەکانی پێشوویشی بە بەردەوامی لەسەر ماوە، بەتایبەتی کاریگەری نیوکانتیزم. سەرەڕای ئەوەی لەم قۆناغەدا لۆکاش گرنگی بە سیاسەت دەدات و لە کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم لە حکومەتە کۆمۆنیستییەکەی بیلا کون ( Bela kun) لە هەنگاریادا بەشداری دەکات، کە ئەمەش پاڵی پێوەدەنێت، ئاشنایەتی لەگەڵ بەرهەمەکانی مارکس و لینین و روزا لۆکسمبۆرگ پەیدا بکات.

قۆناغی سێیەم: ئەم قۆناغە لە ساڵی ١٩٢٤ تاوەکو ساڵی ١٩٣٣ بەردەوام دەبێت، لەم قۆناغەشدا لۆکاش رەخنەیەکی زۆری لێدەگیرێت، ئەویش بە هۆی هەڵوێستە سیاسی و فەلسەفییەکانەوە کە لە قۆناغی پێشتردا هەیبوون، لەم قۆناغەدا لۆکاش دەگەڕێتەوە سەر کارە ئەدەبییەکانی خۆی و بەتایبەتی لە گۆڤاری (لینکسکورف-Linkskurve) بڵاویدەکردنەوە، لەم قۆناغەدا لۆکاش دەیەوێت پەیوەندی خۆی بە مارکسیزمی ئەرسۆدۆکسی دەربخات، لە هەمانکاتیشدا رەخنە لە

کتێبی (تیۆری ڕۆمان) دەگرێت کە پێی وابووە بیروبۆچوونەکانی لەمەڕ وەرچەرخان لە ئایدیالیزمی خودی بۆ ئایدیالیزمی بابەتی ڕاستگۆیی تێیدا نەبووە، هەروەها لەم قۆناغەدا ڕەخنە لە کتێبی (مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) دەگرێت، واسەیری ئەم کتێبە دەکات کە تێکەڵکردنێکی نا ئۆرگانی تیۆری لۆکسمبۆرگ لەمەڕ کەڵەکەبوون لەگەڵ بۆچوونی کاریگەرێتی خودی زێدەڕەوێی چەپڕەوانە.

قۆناغی چوارەم: ئەم قۆناغە بە کۆچکردنی لۆکاش بۆ یەکێتی شورەوی لە ساڵی **١٩٣٣** دەست پێدەکات و بە مردنی ستالین لە ساڵی **١٩٥٤** کۆتایی بەم قۆناغە دێت، بەدرێژایی ساڵەکانی ئەم قۆناغە لۆکاش سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و ئیستاتیکییەکان ببوو، چونکە لەم قۆناغەدا هەر تەنیا ئەدەب پەناگەیەکی وای پێبەخشی بوو کە بە ئازادانە بەردەوامی بە بیرکردنەوەکانی خۆی بدات، ناچار بوو گوێڕایەڵی تیۆری لینین لەمەڕ ڕەنگدانەوە —الانعکاس- بێت و پشتگیری کارە زمانەوانییەکانی ستالین بکات.

قۆناغی پێنجەم: ئەم قۆناغە کە دوا قۆناغە لە ژیانی لۆکاش، بریتییە لە دەربازبوون لە ستالینیزم، لەم قۆناغەدا لۆکاش سەرکۆنەی چالاکییەکانی ستالین دەکات، جا چ لە بواری ئەدەبی کە شێوازی ڕۆمانتیکی شۆڕشگێڕانەی وەرگرتبوو، یاخود لە بواری ئابووریدا کە ڕوویەکی ئابووری تاکڕەوانەی وەرگرتبوو[١٠].

هەرچەندە ئەم دابەشکردنەی ژیاننامەی لۆکاش لە لایەن هنری ئارفون تاڕادەیەك سادەکردنەوەیەکی زەق و بەرچاوی هەوڵ و کۆششە فیکرییەکانی ئەو بیرمەندەی پێوەدیارە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین ئارفون تاڕادەیەك توانیویەتی لە چوارچێوەیەکی ئایدۆلۆژیدا قۆناغە فیکرییەکانی لۆکاش دیار بکات، بەو پێنج قۆناغەی کە دیاریکردووە.

بۆ ئەوەی تووشی ئەو شێوازە سادەکردنەوەی ژیاننامەی بیرمەندێکی وەك لۆکاش نەبین کە لە لایەن ئارفۆن ئەنجام دراوە، بەردەوام دەبین لە هەڵخستنی



ژیاننامەی ئەو بیرمەندە لە میانەی مێژووی بڵاوکردنەوەی نووسینەکانیداو پەیوەندی بە هزری بیرمەندانی دیکەوە.

لە ساڵی **١٩١٢** لۆکاش دەگەڕێتەوە ئەڵمانیا دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك ئەم وڵاتە بەجێ دەهێڵێت، **ڤیندلباند** (w. windelband) (١٨٤٨-١٩١٥) و **ریکرت** ( H. Rickert) (١٨٦٣-١٩٣٦) دوو فەیلەسوفی گەورەی ئەوسای ئەڵمانیا بوون، کە نوێنەرایەتی باڵێکی فەلسەفەی نیوکانتیزمان بە نێوی قوتابخانەی هیدلبرج دەکرد[١١]، لۆکاش گەڕایەوە ئەڵمانیا بۆ ئەوەی لە ژێر دەستی یەکێك لەو دوو فەیلەسووفە خوێندنی فەلسەفە تەواو بکات، یوسف ئاباذری لە کتێبەکەیدا _خرد جامعەشناسی- عەقڵی کۆمەڵناسی — دەنوسێت: لۆکاش لە مەجەڕ پێی گوترابوو کە بۆ نزیکبوونەوەی لە (ڤیندلباند) یاخود (ریکرت) سوود لە نفوزی ماکس ڤیبەر وەربگرێت، لۆکاش بە سۆراغی ڤیبەر چوو، ڤیبەر بە گەرمی پێشوازی لێکرد[١٢].

پێش ئەوەی لۆکاش مەسەلەی خۆی بخاتە بەردەم ڤیبەر، ڤیبەر بە هاوسەرەکەی خۆی - ماریانە ڤیبەر- گوت: لۆکاش دەیەوێت بە زووترین کات قسەی لەگەڵدا بکات، چ بیرمەندێکی سەرسوڕهێنەرە، من بە تەواوی لەو باوەڕەدام کە ئەو سیستەمی فەلسەفی خەلق دەکات، ئەو بەمنی گوتووە کە سەرقاڵبوون بە بوارەکانی ئیستاتیکی جگە لە پێشەکییەك زیاتر نییە[١٣].

**ئەمیل لاسك** (Emil Lask) (١٨٧٥-١٩١٥) مامۆستای فەلسەفە بوو لە زانکۆی هیدلبرج، لۆکاش ئامادەی لێکچەرەکانی لاسك دەبوو، زۆر لەو لێکۆڵەرەوانەی لەسەر (لۆکاش) یان نووسیوە باسی کاریگەری (لاسك) یان بەسەر ئەودا کردووە، بەتایبەتی بارکنسوون و لختهایم، ئەو دوو لێکۆڵەرەوەیە لەو باوەڕدان کە لاسك کاریگەرێیەتی زۆری بەسەر (لۆکاش)ەوە هەبووە، بە ڕادەیەك ئەو کاریگەرییەش وای کردووە مەیلی لۆکاش بەرەو ئەفلاتۆنییزمی نوێ رابکێشێت، ئەویش بە هۆی خوێندنەوەی کتێبەکەی لاسك بە نێوی (لۆجێکی فەلسەفە و تیۆری وتەزاکان —منطق الفلسفة و نظرية المقولات)[١٤].





لۆكاش هەر لەميانەی (لاسك)ەوە شارەزایی لەسەر نووسینەكانی جۆرج سۆریل پەیداكرد، باركنسون و لختهایم لەو باوەڕەدان كە كاریگەری لاسك بەسەر لۆكاش لە هەر دوو كتێبی (روح و فۆرمەكان) و (تیۆری رۆمان) بە ئاشكرا دەردەكەوێت، بەڵام لە راستیدا هەروەك دكتۆر رەمتزان محەمەد غانم لە پەڕاوێزی لێكۆڵینەوەیەكی لەسەر لۆكاشدا دەڵێت: كاریگەری دلتای بەشێوەیەكی ئاشكراو روون لە سەر ئەو نووسینانەی لۆكاش دەردەكەوێت، هەروەك چۆن لۆكاش بەراشكاوی لە چاپی نوێ كتێبی (مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) دان بەو راستییە دەنێت[١٥].

هەوڵ و كۆششەكانی ئەمیل لاسك بۆ ناساندن و نزیككردنەوەی لۆكاش لە (ریكرت) هەروەها هەوڵ و كۆششەكانی ڤیبەر بۆ نزیككردنەوەی لۆكاش لە ڤیندلباند بە هیچ ئاكامێك نەگەیشتن، ڤیبەر پێشتر هەستی بە راستیەك كردبوو، لە نامەیەكدا نووسیبووی وای بۆ دەچم كە ڤیندلباند هاوكاری لۆكاش ناكات، چونكە ئەو رقی لە هەر شتێكە پێی بگوترێت مۆدێرن..

بەڵام بۆچوونی ریكرت دەربارەی لۆكاش بەم جۆرە بوو... هەرچەندە وای بۆ ناچم كە ئەو فەیلەسووفێكی (زانستی) خاوەن تێڕوانینێكی قووڵ بێت، بەڵام دڵنیام كە مرۆڤێكی دەرەوشاوەیە، جۆرج لۆكاش هەستی بەوە كرد كە مرۆڤێكی نائاساییە لە رۆشنبیری ئەڵمانیادا ماكس ڤیبەرە، نەك ریكرت یاخود ڤیندلباند كە لەو كاتەدا نێوبانگیان لەو زیاتر بوو[١٦].

لە ساڵی ١٩١٦ لۆكاش كتێبی (تیۆری رۆمان —Theory of novel)ی نووسی پاشان لە ساڵی ١٩٢٠ بڵاویكردەوە[١٧] . لۆكاش لەم كتێبەیدا بۆ یەكەمین جار چەمكی گشتگیری —الكلیة—ی بە كارهێناوە، لەم كتێبەیدا كاریگەری فەیلەسووفی ئەڵمانی **دلتای** (W.Dilthey) (١٨٨٠-١٩١١) بە روون و ئاشكرایی بەسەرەوە دیاربوو.

دیارە دلتای فەیلەسووف كاریگەرییەكی فراوانی بەسەر نەوەی سەردەمی خۆی و نەوەی دواتریشدا هەبووە، چونكە ئەم فەیلەسووفە بەشدارییەكی گەورەی لە



رێنسانسی هێگلیزمدا كردووە، ئەویش لە میانەی كتێبە سەرەكییەكەی دەربارەی بەرهەمەكانی قۆناغی لاوی هێگل و زانستی عەقڵ، لۆكاش لەمەڕ كاریگەری دلتای بەسەریەوە. لۆكاش لە ساڵی ١٩٦٧ لە پێشەكی چاپی نوێی كتێبی (تیۆری رۆمان) دەنووسێت: من بەو جۆرە بیردەكەمەوە وەكو ئەو داهێنانە مەزنەی دلتای لە كتێبەكەیدا (ئەزموونی تێدا ژیان و ئەدەب —التجربە المعاشە و الادب- Das Erlebnisund tung (١٩٠٥) ئەنجامی داوە. كاریگەری دلتای، لۆكاشی بۆ سەر هێگل گواستەوە هەرچەندە دلتای بە بیرمەندێكی سەد دەر سەدی سەر بە فەلسەفەی هێگلیزم لە قەڵەم نادرێت، بەڵام دیارە دلتای رۆڵی خۆی لە گرنگیدان بە بیروبۆچوونە مێژووییەكانی لای هێگل هەبووە، دواتریش كاریگەری هێگل بەسەر (لۆكاش)ەوە لە بیروبۆچوونانەوە دەردەكەوێت كاتێك لۆكاش زۆر گرنگی بەلایەنی مێژوویی لە ئیستاتیكادا دەدات [١٨].

لەوانەیە كتێبی (تیۆری رۆمان) كاریگەری بەسەر تیۆری رەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانكفۆرت هەبووە. چونكە **ئەدرنۆ** كە زۆر بە توندی هێرشی كردۆتە سەر لۆكاشی پیر، واتە رەخنەی لە نووسینەكانی دوایی لۆكاش گرتووە، بەڵام دان بەوەدا دەنێت كە ئەم كتێبەی لۆكاش كاریگەری بەسەر خۆی و سەرجەم بیرمەندانی قوتابخانەی فرانكفورتدا هەبووە[١٩].

تا نووسینی (تیۆری رۆمان) لۆكاش لە چوارچێوەی بیروبۆچوونێك دەخولایەوە كە دەشێت لە بواری فەلسەفەدا بە قۆناغی ئایدیالیزمی لە فكری لۆكاشدا لە قەڵەم بدرێت، ئەمە جگە لەوەی كە بۆچوونی وجودی و رەشبینانە بەسەر زۆربەی نووسینەكانی ئەو كاتەیدا زاڵبوو.

لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی ئۆكتۆبەری ١٩١٧ لە روسیا، لۆكاش لەو بارەوەدا بوو رێگایەك لە بەردەم میللەتدایە بۆ دەربازبوون و رزگاربوون لە جەور و ستەم و چەوساندنەوە و نائومێدی، ئەو بیرمەندە خەونی بەشۆڕشێكی وەكو شۆڕشی ئۆكتۆبەر دەبینی كە لەسەر خاكی وڵاتەكەیدا (مەجەر) بەرپابێت. لۆكاش لە هەمان





سالّدا هەندێ لە وتارەکانی خۆی کە بە زمانی مەجەری نوسیبووی، پێشکەش بە بلابالاش (Balabalaz)ی سۆسیالیستی مەجەری کرد، ئەمەش ئاماژەیەکی تەواوبوو بۆ هاتنە ناو دونیای سیاسەتەوە.

لە ساڵی ١٩١٨دا لۆکاش چووە ریزی حزبی شیوعی هەنگاری –مەجەری[٢٠]، هەروەها بەشداری لە شۆڕشی ١٩١٩ کە لە مەجەردا روویدا کردوو، پلەی رێپێدراوی گەل بۆ کاروباری رۆشنبیری میللی لە حکومەتەکەی بلا کون وەرگرت، بەڵام دوای شکستی شۆڕشەکە رایکردە ڤیەننا[٢١].

لەم کەینەوبەینەدا **ماکس ڤیبەر** لە نامەکیدا بۆ باوکی لۆکاش نوسیبووی:- ئەوەی لە لای من زۆر گرنگە ئەوەیە کە کوڕەکەتان بگەڕێتەوە سەر کاری خۆی و پێویستە لەسەری بە تەواوی واز لە دەستتێوەردانی بێ سوودی لە سیاسەت بهێنێت، چونکە هەوڵ و کۆششی ئەو بەفیرۆ دەچێت، ئەو رێگایەکی زۆر هەڵەی هەڵبژاردووە[٢٢].

ئەمە گەورەترین جیاوازی نێوان ماکس ڤیبەر و لۆکاش بوو، چونکە ڤیبەر پێشتر بە لۆکاشی گوتبوو سۆسیالیزم لە ئاکامدا بیرۆکراسی و داپلۆساندنێکی مالوێرانتر لە سەرمایەداری دەهێنێتەکایەوە، بەڵام لۆکاش لەسەر بۆچوونەکانی خۆی دەرهەق بە سۆسیالیزم بەردەوامبوو، ڤیبەر لە دوانامەی بۆ لۆکاش نوسیبووی: ئەو شتەی کە ئێمە لە یەکترجیادەکاتەوە.... بە دوو سێ وشەی مرۆڤانە و دۆستانە کە بە یەکتریان دەڵێن لەناو دەچێت و نامێنێت).

ڤیبەر لە ساڵی ١٩٢٠ کۆچی دوایی کرد، لۆکاش مردنی ڤیبەر بە ناخۆشترین رووداوی ژیانی خۆی دادەنا.

تقی ئازاد ئەرمەکی لە کتێبەکەیدا (تێوەرەکانی کۆمەڵناسی) دەڵێت: لە راستیدا بیری لۆکاش پێکهاتەیەکە لە بیروبۆچوونەکانی کانت و هێگڵ و دلتای و کیرکیگارد و سیمل و ڤیبەر و مارکس... لۆکاش لە پێناو لابردنی تەمومژی لەسەر فیکری مارکس، پەنای بۆ فیکری هێگڵ بردووە، لەپێناو پرکردنەوەی کەلێنەکانی



هزری هێگل لە دیدگایەکی فەلسەفییەوە پەنای بۆ ڤیبەر و سیمل بردووە، ، لۆکاش لای رەخنەگران پێش ئەوەی وەك بیرمەندێکی مەتریالیست بووبێت پەیڕەوکاری بیروبۆچوونەکانی لینین و هێگڵیزمی چەپڕەوانە بووە، هەرچەندە لۆکاش وەك نووسەرێکی مارکسی نێوبانگی دەرکردووە، بەڵام لە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی هێگڵدابوو، ئەم جۆرە هێگڵیزمییەی لۆکاش لە نیومارکسیزمە رۆژئاوایی ئەوروپییەکاندا کارێکی بێ وێنەبوو.

هەندێك کەس لەوانە (لوسیان گۆلدمان) لەو باوەڕەدابوو کە لۆکاش لە هەوڵ و کۆششی بە هێگڵیزمکردنی مارکسیزم بووە[٢٣].

لە دوای نووسینی هەردوو کتێبی ( روح و فۆرمەکان) و ( تیۆری رۆمان)، دواتر لۆکاش چەند نوسینێکی دیکەی بڵاوکردەوە، کە بریتی بوون لەمانە: مێژوو و هۆشیاری چینایەتی، مانای ریالیزمی هاوچەرخ، دارمانی عەقل، گۆتە و سەردەمەکەی، ئەنتۆلۆجیای بواری کۆمەلایەتی، وچەندان نووسینی دیکەش..ئەم بیرمەندە لە دوا قۆناغی ژیانیدا خەریکی نووسینی کتێبێك لەمەڕ ئەخلاق بوو، بەڵام مەرگ رێگای پێنەدا ئەم کارە تەواو بکات و لە ٤ی یونیوی ١٩٧١ لە تەمەنی هەشتا و شەش ساڵیدا کۆچی دوایی کرد [٢٤].





## تەوەری دووەم

### لۆکاش لە نێوان سیاسەت و ئیستاتیکادا

لە سبتمبەری ساڵی ١٩١٩ لۆکاش لە ڤیەننا، بە هۆی چالاکی سیاسییەوە دەستگیر کرا، بەڵام بە هۆی ئەو نێوبانگەی بەدەستیهێنابوو کە ئەو کاتەی لە هیدلبرج بوو، هەروەها بە هۆی هەوڵ و کۆششی رۆماننوس (تۆماس مان) لە وروژاندنی رای گشتی بۆ ئازادکردنی لۆکاش، ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ئەوەی کە لۆکاش ئازاد بکرێت، سەرەڕای ئەمەش ئەم بیرمەندە لە بەشداریکردنی گفتوگۆ سیاسییەکان کە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی رۆشنبیران لە ڤیەننادا ساز دەدران بەردەوام بوو[٢٥].

لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢١ لۆکاش بووە سەرنووسەری گۆڤاری (کۆمۆنیزم)، ئەم گۆڤارە گوزارشتی لە بیروبۆچوونی چەپەکانی ئەو کاتەی ئەوروپا دەکرد، لەم ماوەیەدا کە لۆکاش سەرنووسەری ئەم گۆڤارە بوو (تێزەکانی بلوم)ی بڵاوکردووە، بلوم(Blum) ناوی نهێنی لۆکاش بوو لەناو رێکخراوی حزبی شیوعی مەجەریدا، لۆکاش لە (تێزەکانی بلوم) دا بە راشکاوی هەڵوێستی سیاسی خۆی دەربڕیوە، لە میانی خوێندنەوەیەکی وردی ئەم نووسینەی لۆکاش (تێزەکان..) دەردەکەوێت کە لۆکاش زیاتر مەیلی بەلای سۆسیال دیموکراتدا هەبووە، هەر لەو کاتەدا لۆکاش لەگەڵ (تێزەکانی بلوم) دا، لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر گرفتی پەرلەماننووسی (one the question of parliamentarism)، کە تێدا بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە نابێت بەشداری لە پەرلەمانی برجوازی بکرێت. کە ئەم بۆچوونەش لە لایەن (لینین)ەوە لە کتێبی (کۆمۆنیزم و نەخۆشی چەپڕەوی منداڵانە)دا رەخنەی لێگیرا[٢٦].

لە ساڵی ١٩٢٣دا کتێبی (مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) نووسی، کە بووە هۆی ئەوەی لە لایەن کۆمۆنیستەکانەوە رەخنەیەکی زۆری لێبگیرێت و بەریڤۆژینیست لە



قەڵەم بدرێت. لە کۆنگرەی پێنجەمی کۆمینترندا هێرش کرایە سەر ئەو کتێبە، (دروبن) بیرمەندی سۆڤیەتی ئەو کات دەڵێت: هەوڵ و کۆششی لۆکاش لە تەفسیرکردنی مارکس لە رێگای دوورخستنەوەی لە ئەنگلز، وای لێکرد بەرەو ئایدیالیزمی فەلسەفی بچێت، ئەو دەستبەرداری دیالەکتیکی سروشت ببوو، چەندین بیرمەندی دیکەی کۆمۆنیستی هێرشیان کردە سەر ئەم کتێبە، هەرچەندە ئەمە وای لە لۆکاش کرد کە واز لەو کتێبەی بهێنێت، لەبەر ئەوە وەڵامی کەسی نەدایەوە[٢٧].

بەڵام لە پێشەکی چاپی نوێی کۆی بەرهەماکانیدا، لۆکاش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە ئەو هەرگیز وازی لە هەموو ئەو بیروبۆچوونانە نەهێناوە کە لەو کتێبەیدا هاتوون، هەروەها ئەو رەخنە لە خۆگرتنەوەی کە لە ساڵی ١٩٣٣ ئاراستەی ئەو کتێبەی کرد بە پاڵنەری چەند هۆکارێکی تەکتیکیەوە بوو، هەروەها ئاماژەشی بۆ ئەوە کردبوو کە هەر چەندە ئێستاکە پێویست بەوە ناکات بەرگری لەو کتێبەی بکات، بەڵام لەو باوەڕەدا نییە کە هەموو ئەو بیروبۆچوونانەی لەو کتێبەیدا خراونەتەڕوو هەڵەبن.

لۆکاش لە بەشی یەکەمی ئەو کتێبەیدا( مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) بە ناونیشانی مارکسیزمی رەسەن چییە؟ نووسیویەتی: مارکسیزمی رەسەن ئەوە ناگەیەنێت، کە بەبێ رەخنەگرتن تەسلیمی ئاکامەکانی لێکۆڵینەوەی مارکس ببین، هەروەها ئەوەش ناگەیەنێت کە باوەڕ بەو تیۆرەییە یاخود باوەڕ بە تیۆرێکی دیکە بکەین، یاخود تەئویلی کتێبی (پیرۆز) بکەین، رەسەنایەتی سەبارەت بە مارکسیزم پێچەوانەی ئەمەیە، بەشێوەیەکی تایبەت بۆ میتۆد دەگەڕێتەوە، رەسەنایەتی بریتییە لەوەی کە بەشێوەیەکی زانستییانە باوەڕ بکەین دیالەکتیکی مارکسیزم میتۆدێکی لێکۆڵینەوەی دروستی هێناوەتەکایەوە، ئەو میتۆدەش ناکرێت پەرەی پێبدرێت و تەواو بکرێت و قووڵبکرێتەوە، تەنیا بە ئاراستەی دامەزرێنەرەکەیەوە نەبێت.. هەموو هەوڵێك بۆ تێپەڕاندن لەو میتۆدە بۆ چاککردنی جگە لە شێواندنی و تێکدانی، بە هیچ ئاکامێکی دیکە نەگەیشتوون[٢٨].





لۆكاش لەم كتێبەیدا( مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) باس لەو سێ بابەتانە دەكات: سروشتی میتۆدی ماركسیزم، چەمكی گشتگیری –الكلیة (Totality)، گرفتی نامۆبوون و بەشتبوون (الاغتراب و التشیٔ). نامۆبوونی مرۆڤ لە كۆمەڵگای سەرمایەداریش خەسڵەتێكی ئەو كۆمەڵگایەیە، كە مرۆڤ هەست دەكات تێیدا بووە بە كەرەستەیەك یاخود بووە بە كاڵایەك لە بازاڕدا سەودای پێدەكرێت.

لە راستیدا لۆكاش بە درێژایی ژیانی فیكری مامەڵە لەگەڵ بابەت دەكات و ناتوانێت دەستبەرداریان ببێت، هەروەها لە كتێبەكەیدا ئەم سێ بابەتانەی سەرەوە لە یەكتر جیاناكاتەوە، چونكە سروشتی میتۆدی ماركسی و جیاوازی لە گەل زانستی برجوازی لەوەدا دەبینێتەوە كە میتۆدی ماركس تێڕوانینێكی گشتگیری بۆ مەسەلەكان هەیە، واتە زاڵبوونی گشت بەسەر بەشێك، یاخود لێكدانەوەیەكی گشتگیری ئەو بەشانەی گشت (الكل) پێكدەهێنن، ئەمە لەكاتێكدا زانستی بۆرژوازی بە پەرشوبڵاوی دەیانهێڵێتەوە و ئەو بەشانە لە یەكتر دادەبرێت كە گشت پێكدەهێنن، لەبەر ئەوە میتۆدی ماركسیزم لە بەرامبەر زانستی بۆرژوازیدا تێڕوانێكی فەراوانتری بۆ دیار دەكەن، ئەویش تێڕوانینێكی هەمە لایەنی و گشتگیرییە.

لای لۆكاش ماركس توانیویەتی داهێنەرانە ئەو چەمكانەی هێگڵ لەگەڵ میتۆدەكەی خۆیدا بگونجێنێت و لە لێكدانەوەكانیدا بۆ كۆمەڵگای سەرمایەداری بەكاریان بهێنێت[٢٩] .

لە ساڵی ١٩٢٤ كاتێك (لینین) دەمرێت، لۆكاش كتێبێكی لەسەر دەنووسێت، كە ناونیشانی سەرەكی كتێبەكە بریتی بوو لە (لینین Lenin). ناونیشانی لاوەكی كتێبەكەش بەم جۆرەبوو: (لێكۆڵینەوەیەك لە بیری پراكتیكی)، لۆكاش لەو كتێبەیدا باس لە فیكری **لینین** لە مومارەسەكردنی سیاسییانەوە دەكات و هەروەها ئەو فیكرە شی دەكاتەوە. لەم بارەیەوە لۆكاش دەڵێت: لە دوای مردنی لینین دەزگایەكی پەخش و بڵاوكردنەوە داوای لێكردم وتارێكی كورت لە بارەی ئەوەوە بنووسم، منیش رازی بووم لە چەند هەفتەیەكدا كتێبێكی بچووكم نووسی. ئەوەی مەبەستم بوو لەو كتێبەدا



ئەوەبوو، كە لینین بە تەواوكردنی سادەی تیۆری ماركس و ئەنگلز دانەنێین و بە سیاسەتمەدارێكی واقیعی واشی لە قەڵەم نەدەین، كە بیرتیژییەكی پراكتیكی هەبووە، بەڵكو مەبەستم ئەوەبوو درك بە خەسڵەتە راستەقینەكانی فیكری ئەو بكرێت.

بەكورتی دەتوانین ئەو وێنەی (**لینین**)، بەم جۆرە كورت بكرێتەوە، هێزی تیۆری ئەو لەوە دایە كە هەموو وتەزایەك–**المقولة**- هەر چەندە وتەزایەكی فەلسەفی رووت بێت، لای ئەو پەیوەستە بەكاركردن لەناو مومارەسەكردنی بەشەریدا، لە هەمان كاتدا سەبارەت بە هەموو چالاكییەك كە هەمیشە ئەو جەختی لەسەر ئەوە دەكرد، كە شیكردنەوەیەكی هەستپێكراو بۆ دۆخێكی هەستپێكراو ئەنجام بدرێت ، شیكردنەوەی بە پەیوەندییەكی ئۆرگانی و دیالیكتیكی لەگەڵ پرەنسیپەكانی ماركسیزم دەبەستەوە، ئەمەش مانای ئەوە نییە كە ئەو تیۆرستێكە یاخود كەسێكی پراكتیكییە، واتە (متمرس)ێكە بە مانای وشە، بەڵكو مانای ئەوەیە كە بیرمەندێكی بلیمەتی مومارەسەكردنە، بۆ مومارەسەكردنی گواستنەوەی تیۆر گوێزەرەوەیەكی بە توانایە، پیاوێكە تێڕوانینی تیژی هەمیشە ئاراستەی خاڵی وەرچەرخان دەكات، بەشێوەیەك كە تیۆر دەبێتە مومارەسە و مومارەسەش دەبێتە تیۆر[٣٠] .

**هنری ئارفون** لەو باوەڕدایە كە لۆكاش دوای ئەوەی هەستی كرد حزبەكەی –حزبی شیوعی مەجەری- خراپ لە كتێبی (مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) گەیشتووە، ساڵێك دوای ئەم كتێبەی كتێبێكی لەسەر لینین نووسی كە بەپێی توانای خۆی هەوڵیداوە رێز لە بڕیارە سیاسییەكانی حزبەكەی بگرێت[٣١] .

لە ساڵی **١٩٢٥** لۆكاش هەندێ لێكۆڵینەوەی لەسەر **بۆخارین** و تیۆری مەتریالیزمی مێژووی نووسی[٣٢] . لەو ماوەیەدا ململانێیەكی زۆر لە ئۆردوی سۆسیالیزمیدا لە نێوان لایەنگرانی ستالین و بەرهەڵستكارانیدا لە ئارادابوو، لۆكاش بەشدرای ئەو ململانێیەی كرد، لە ئاكامدا بووە لایەنگری ستالین وباوەڕی بەو بۆچوونەی ستالین هێنا كە دیگوت دەتواندرێت سۆسیالیزم لە یەك دەوڵەتدا دابمەزرێت، واتە لۆكاش دژی بۆچوونەكەی **ترۆتسكی** وەستا كە لەمەڕ شۆڕشی هەمیشەیی (**الثورة**





**الدائمة)** بوو لەسەرتاپای جیهاندا، لۆکاش لە چاپی نوێی (مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) باسی ئەو بزووتنەوە چەپانەی ئەو کاتە دەکات، کە لە ئەوروپادا لە ئارادابوون و لایەنگیری بیربۆچوونەکانی (تروتسکی) یان دەکرد و بە بزووتنەوەیەکی زێدەڕۆ — **المتطرف**- یان لە قەڵەم دەدا[٣٣].

لە ساڵی ١٩٣٠ لۆکاش لە کێشە سیاسییەکانی وڵاتەکەی —مەجەر- دوور دەکەوێتەوە و ڤیەنا بەجێدەهێڵێت و ڕوودەکاتە مۆسکۆ و لە ئەنستتیوتی مارکس — ئەنگلز کاردەکات، ئەمەش دەرفەتی ئەوەی بۆ دەرخسێنێت کە هێڵکارییە ئابووری و سیاسییەکانی مارکس لە ساڵی ١٨٤٤ بەوردی بخوێنێتەوە. خوێندنەوەی ئەو هێڵکارییانە کاریگەری زۆری بەسەر لۆکاش هەبووە لەبەر ئەوەیە دەڵێت: ئەو دەستنووسانە —**المخطوطات**- یارمەتیان دام و کە واز لەو بیروبۆچوونانەی پێشووم بهێنم کە مۆرکێکی ئایدیالیزمییان پێوەبوو[٣٤].

لە هاوینی ١٩٣٠ لۆکاش دەچێتە بەرلین بۆ ئەوەی بەردەوامی بە پرۆژەی کارکردنی خۆی بدات لەمەڕ ئیستاتیکاوە، کە زۆر گرنگی بەم بوارەدەدا ، هەر وەك خۆی دەڵێت لە پێناوی ئامانجە ئەخلاقییەکاندا پەنای بۆ سیاسەت بردبوو، لەوەش دڵنیا بوو کە بەهرەی ئەوەی تێیدایە وەکو کەسێکی پراکتیکی مومارەسەی سیاسەت بکات، ئەمەش قسەکانی ماکس ڤیبەرمان دەهێنێتەوە یاد کە لەمەڕ خۆتێوەگلاندنی بێ سوودی لۆکاش لە سیاستەوە کە پێشتر باسمان لێوە کرد.

ئەو کاتەی لۆکاش لە بەرلین بوو، هێتلەر دەسەڵاتی گرتەدەست، لەبەر ئەوە ناچار بوو دووبارە لە ساڵی ١٩٣٣ بگەڕێتەوە مۆسکۆ، کە تا کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی ١٩٤٤ لە مۆسکۆ مایەوە و لە ئەنستتیوتی فەلسەفە سەر بە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی کاری دەکرد.

لە ساڵی ١٩٣٤ (ڕاپۆرتێك لە بارەی ڕۆمانەوە)ی بۆ گۆڤاری (ڕەخنەی ئەدەبی) ڕووسی نووسی[٣٥].



لە ساڵی ١٩٤٥ کاتێك گەڕایەوە مەجەر (ڕاکوزی — Rakosi) شوێنێکی بەرزی لە سەرکردایەتی حزبی شیوعی مەجەری هەبوو و چەندان پلە و پایەی بۆ لۆکاش پێشنیارکرد[٣٦] ئەوەبوو لۆکاش بووە ئەندامی سەرۆکایەتی ئەکادیمیای مەجەری و پرۆفیسۆری ئیستاتیکا و فەلسەفەی شارستانی لە زانکۆی بۆداست.

لۆکاش لە ساڵی ١٩٤٧ (گۆتە و سەردەمەکەی) بلاودەکردەوە، پاشان لە ساڵی ١٩٤٨ (چەند وتارێك دەربارەی ڕیالیزمی) بلاوکردەوە، لە ساڵی ١٩٤٩ (ڕیالیزمی ڕووسی لە ئەدەبی جیهانی) و لە ساڵی ١٩٥١ (ڕیالیزمی ئەڵمانی لە سەدەی نۆزدەهەم)ی نووسی، لە ساڵی ١٩٥٢ (بەلزاك و ڕیالیزمی فەڕەنسی) بلاوکردەوە، لە نووسینەکانی ئەم قۆناغەیدا لۆکاش ڕەخنەی لەو شەپۆڵە نوێخوازانەی ئەدەب دەگرت کە لە بەرهەمەکانی کافکا و جویس و نووسەرانی دیکە خۆیان دەنواند، هەروەها ڕەخنەی لە ڕێبازی ڕیالیزمی سۆسیالیستی دەگرت بەوەی کە گوێی بە ململانێ و ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای سۆسیالستی نادات[٣٧].

لە ساڵی ١٩٥٣ کاتێك ستالین دەمرێت، هەڵوێستی لۆکاش لە بەرامبەر ئەو ڕابەرە کۆمۆنیستییە دەگۆڕێت و ڕەخنەی لە بۆچوونە دیماگۆجییەکانی دەگرێت، کە پێی وابووە زیانێکی زۆری بە فەلسەفەی مارکسیزم گەیاندووە.

لە جەنگی دووەمی جیهانی وڵاتە سەرمایەدارەکان و وڵاتە سۆسیالیزمەکان بەیەکەوە دژی فاشیزم و نازیزم وەستان، ئەمە وای لە چەپەکانی ئەوروپا کرد کە جۆرە بیرکردنەوەیەکی دیکەیان لەمەڕ ململانێی نێوان ئەو دوو سیستەمە هەبێت، ئەوەبوو بۆچوونی بەیەکەوە پێکەوە ژیانی ئاشتەوایی —التعایش السلمي- لە سیاسەتی وڵاتە ستالینییەکاندا خۆی چەسپاند، (لۆکاش)یش لەگەڵ ئەم بۆچوونە دابوو، لە کتێبی (مانای ڕیالیزمی هاوچەرخ) کە لە ساڵی ١٩٥٧ بلاویکردەوە[٣٨] ، باسی ئەو هاوپەیمانێتییەی سۆسیالیزم و سەرمایەداری لە دژی نازیزم دەکات، داواش لە هەردوو سیستەم دەکات کە لە بە یەکەوە ژیانێکی ئاشتییانەدا دژی مەترسییەکانی جەنگ کە هەڕەشە لە بوونی مرۆڤایەتی دەکات بوەستن، ئیتر لۆکاش بەو باوەڕە دەگات کە





ناکرێت هەڵوێستی مرۆڤ بە پێشکەوتووخواز یاخود کۆنەپەرست لەسەر بنەمای هەڵوێستی بەرامبەر سۆسیالیزم و سەرمایەداری دیاری بکرێت، بەڵکو ئەم هەڵوێستە لەسەر بنەمای هەڵوێستی لەمەڕ شەڕ و ئاشتییەوە دیاری دەکرێت[٣٩].

لۆکاش لە تەمەنی حەفتا ساڵیدابوو کە بەشداری شۆڕشی مەجەری ساڵی ١٩٥٦ی کرد و لە حکوومەتی (ئمری ناجی) بوو بە وەزیری رۆشنبیری، بەڵام زۆری نەخایاند لەو کارەی لادرا، دوای ئەوەی سۆڤیەت مەجەری داگیر کرد لۆکاش بۆ رۆمانیا دوورخرایەوە، رێگای گەڕانەوەی پێنەدرا تاوەکو ئەپریلی ساڵی ١٩٥٧، کاتێك گەڕاوە وڵاتەکەی بینی لە زانکۆ و لە حزبی شیوعی دەرکراوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ببووە جێگای رەخنە لێگرتنێکی زۆر لە لایەن شیوعییەکان بە هۆی نووسینی لەسەر هێگڵ و کتێبی (داڕمانی عەقڵ) [٤٠] .

لە ساڵی ١٩٥٤ لۆکاش کتێبی (داڕمانی عەقڵی)ی بڵاوکردەوە، کە تێدا باس لەو زەمینە فیکرییە دەکات کە لە ئەڵمانیادا هێتلەری دروست کرد، لە پێشەکی ئەو کتێبەدا لۆکاش دەنووسێت، بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەمان ئەوەیە کە بزانین بە چ رێگایەك ئەڵمانیا لە زەمینەی فەلسەفەدا بە هیلتەر گەیشت[٤١].

سەرەڕای ئەم رەخنە لێگرتنەی کە لە لۆکاش دەگیرا ، لەو کاتەی کە لە ساڵی ١٩٥٧ گەڕایەوە مەجەر، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٥ لە زانکۆی بۆدابست کورسی پرۆفسۆری فەلسەفەی پێدرایەوە، لەم ماوەیەدا دەرگای ئازادی تاڕادەیەك بە رووبدا کرایەوە و پەیتا پەیتا نووسینە قەدەغەکراوەکانی خۆی بڵاوکردەوە و گەڕایەوە سەر پرۆژەی کارکردنی خۆی لەسەر ئیستاتیکا و کتێبی (ئەنتۆلۆجیای بوونی کۆمەڵایەتی) لە ساڵی ١٩٦٩ بەسێ بەرگ تەواوکرد [٤٢].

جۆرج لۆکاش لەگەڵ ئەو هەموو رەخنانەی لە لایەن سۆسیالیستییەکانەوە لێی دەگیرا، بە فەیلەسوفێکی سۆسیالیستی سەردەمی نوێ نێوبانگی دەرکردووە، هەروەك لە خستنەڕووی ژیانامەکەیدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە ساڵەکانی دوایی تەمەنیدا ژیانی لە مەجەر بردۆتە سەر و خەریکی پرۆژە ئیستاتیکەکانی خۆی بووە و تاپێی





کراوە لە بواری سیاسەتدا خۆی دوورە پەرێز گرتووە، دیارە ئەمەش بۆ نووسەرێکی وەك ئەو لەو سەردەمەی کە لە مەجەر دەژیا، کارێکی زۆر دژوار بووە، چونکە کاتێك لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانیدا لێی دەپرسن کە ئەدەب لە مەجەر غەرەقی سیاسەت بووە، هۆیەکەی بۆچی دەگەڕێتەوە؟

ئەو لە وەڵامدا دەڵێت: هۆیەکە سیاسییە، تاوەکو بزانی پێت دەڵێم لە سەدەی نۆزدەهەم شاعیرێك هەبوو کە یەکێك بوو لە گەورەترین شاعیرانی مەجەر بوو، ناوی (بیتونی) بوو، ئەم شاعیرە لە بە ناوبانگترین چامەی شیعریدا بە ناونیشانی (چۆنی پاڵەوان)، بۆ یەکەم جار ئەم شاعیرە زمانی جووتیارانی لەسەر زاری پاڵەوانێکیدا بەکارهێنا، ئەو پاڵەوانە واخۆی دەبینی کە ئەو مەڵبەندی روحی و پاڵەوانیەتێتی خەڵکە... شیعر بە سیاسەت بەسترایەوە، بە کێشەکانی خەڵك بەسترایەوە، لەو کاتەوە پاساو دەهێندرایەوە، کە مەجەر بەرگری لە سەربەخۆیی دەکات، ئەو شاعیرەش یەکێك بوو لە پاڵەوانەکانی بزووتنەوەی ساڵی ١٨٤٨ و لە شەڕی سەربەخۆییدا کوژرا، هاوڕێکەی (یانووس ئرانی)ی شاعیریش بەشداری شەڕی دەکرد، لەو مێژووەوە رۆشنبیران لە مەجەردا خۆیان وادیتەوە، کە تاسەریان لە سیاسەتدا غەرقبوونە و تێیدا گلاون، هەر نووسەرێکی مەجەری ئەگەر لە پێناو کێشەیەکی سیاسیدا بخرێتە بەندیخانە زۆر پێی ئاساییە[٤٣].

لە وڵاتێکی وەك مەجەر کە خاوەنی مێژوویەکی دوورودرێژ لەمەڕ تێکەڵکردنی هەموو رووەکانی ژیان لەگەڵ سیاسەتدا، کەچی بیرمەندێکی وەك جۆرج لۆکاش کە خەڵکی ئەم وڵاتەیە، سەرەڕای تێکەڵبوونی لەگەڵ سیاسەت، بە خاوەنی گەورەترین و فراوانترین پرۆژەی ئیستاتیکی دادەندرێت، سەرەڕای ئەوەی کە بیری لۆکاش لە بەستنەوە و تێکەڵکردنی بیروبۆچوونەکانی ماکس ڤیبەر لەگەڵ مارکس (لەمەڕ تەفسیرکردنی کۆمەڵگای نوێ) پێکهاتووە، لۆکاش بەوردبوونەوە لە ژێرخان سەربارەت بە مارکس و عەقڵانییەت سەبارەت بە ڤیبەر تەفسیرکردنی نوێی هێنایەکایەوە، کە لە کۆتاییدا دەربڕینێکی گشتگیری لەمەڕ کاڵا و هۆشیاری چینایەتی خستنەڕوو[٤٤].

## ئەنجام

لە میانەی دوو تەوەری باسەکەماندا لەسەر بیرمەندی سەدەی بیستەم جۆرج لۆکاش، باسمان لە ژیاننامە و مێژووی نووسین و بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی وا دیاریکردنی کاریگەری هزرمەندان بەسەریەوەکرد، هەروەها باسمان لە هزری ئەو بیرمەندە کرد لە نێوان سیاسەت و ئیستاتیکادا.

لە میانەی باسەکەماندا قۆناغە جیاجیاکانی فیکری ئەو بیرمەندەمان بۆ ئاشکرابوو، کە بە چ جۆرە هەڵکشان و داکشانێکدا تێپەڕیووە، هەرچەندە لەوانەیە نەتواندرێت بە شێوەیەکی وردبینانە دەستنیشانی هێڵێکی دیاریکراوی بیرکردنەوەی ئەو بیرمەندە بکرێت، چونکە ئەو بیرمەندە هەمیشە هەولیداوە بە کاریگەری فەیلەسوفێکی دیاریکارو نەوەستێت، بەڵکو هەوڵی داوە، باوەش بۆ سەرجەم ئەو فیکرانە بکاتەوە کە شوێنێکی بەرچاویان لە مێژووی فیکری رۆژئاوا هەبووە، بەڵام لە گەل ئەوەشد دەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی گشتی کاریگەری فەلسەفەی هێگڵ لە سەر بیرو بۆچونەکانی لۆکاشدا روون و ئاشکرا رەنگی داوەتەوە، ئەم رەنگدانەوەیەش لەسەر زۆربەی بەرهەمەکانیدا بەر چاو دەکەوێت.

تێکەڵبوونی لۆکاش لەگەڵ سیاسەتدا لەوانەیە پاڵنەرێکی تیۆری هەبوو بێت، بەڵام ئەگەر ئامانجێکی ئەخلاقی لە پشت ئەم تێکەڵبوونەی بوو بێت هەروەك خۆی دەڵێت؛ ئەوا لەسەر حیسابی پرۆژە ئیستاتیکاییەکەی بووە، کە زۆر جاران ناچاربووە بۆ رازیکردنی دەسەڵاتی سیاسی- جا چ دەسەڵاتی حزبەکەی یاخود دەسەڵاتی سۆڤیەتی ئەو ساکەی کە لە مۆسکۆدا دەژیا بووبێت-، هەندێ بیروبۆچوونی لەمەڕ ئیستاتیکا بە شێوەی تەمومژاوی بخاتەڕوو.

ئەمە جگە لەوەی کە پاشگەزبوونەوەی لە هەندێ بیروبۆچوونەکانی، دوای ئەوەی هەستی کردووە دژایەتی ئەو بیروبۆچوونانەی کراوە هەروەك خۆی دەڵێت: ئەم





پاشگەزبوونەوانە تاکتیکی کارکردنی خۆی بووە، بەڵام لە راستیدا ئەگەر بەکارهێنانی ئەم تاکتیکە لە لایەن لۆکاشەوە بەردەوامبونی پێبەخشیبێت لە کارکردنیدا، ئەوە ناتوانین رێگا لە خوێنەری بگرێت کە گومان بکات لەوەی سەقامگیرییەکی فیکری لە نووسینەکاندا هەبووبێت.

شیکردنەوە و لێکدانەوەی جۆراوجۆر بۆ ئەو بیرمەندە، نیشانەی دەوڵەمەندی و فراوانی بیروبۆچوونەکانیەتی، نەك بە هۆی لە ئارادابوونی بیروبۆچوونی نەگونجاو و دژبەیەك، چونکە لۆکاش تاڕادەیەك هەوڵیداوە بە پێشینەیەکی فەلسەفەی کانتیزمی نوێ و هێگڵیزم و مارکسیزم مامەڵە لەگەڵ فەلسەفەی نوێ لە سەدەی بیستەمدا بکات.

لە راستیدا دەکرێت جۆرج لۆکاشی فەیلەسووفی سەدەی بیستەم لەم بوارەدا وەك سومبولێکی ئیشکردنی رۆشنبیران ئاماژە بۆ بکرێت کە توخنی سیاسەت دەکەون.

ئەو بیرمەندەیە توانی لەناو ئەو ململانێیانەدا لەگەڵ دەسەڵات و سیاسەت لەگەڵ لوتکەی بیرکردنەوە و فیکری رۆژئاوادا، سەرکێشانە بەردەوامی بەکاروانی خۆی بدات، هەروەها توانی کلتورێکی فەلسەفی لە بوارەکانی ئیستاتیکا و فیکرەوە بەرهەم بهێنێت.

## پەراوێزەکان

١- جورج لختهایم ، لوكاش ، سلسلة اعلام الفكر العالمي، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت ١٩٧٥، ص ١٣٢.

٢- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش، مسيرة فكر وحياة ، منشور في مجلة المنار، عدد ٥٠، فبراير/ شباط ١٩٨٩، ص ١٤٦.

بیرو بۆچوونەکانی لۆکاش سەرچاوەیەکی سەرەکینە بۆ هزری (لۆسیان گۆلدمان )، بۆزیاتر زانیاری بڕوانە، عوسمان یاسین، بونیادگەری پێکهاتووی، میتۆدی لوسیان گۆلدمان، چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین، هەولێر ١٩٩٩ ، ل ٨.

٣- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٧، هەروەها بڕوانە: د. تقي ازاد ارمكى، **نظريه هاى جامعه شناسى**، انتشارات سروش، چاپ اول، ١٣٧٦، ص ١٦٨

٤- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ١٤٧-١٥٣.

٥- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٧.

٦- یوسف اباذرى ، خرد جامعه شناسى، ، **طرح نو**، چاپ اول، ١٣٧٧، ص ١٦٧.

٧- یوسف اباذرى ،سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٧.

٨- جورج لوكاتش ، التاريخ و الوعى الطبقى،ترجمة د. حنا الشاعر، دار الاندلس، طبعة الاولي، ١٩٧٩، ص ٢٦٧.

٩- هنرى ارفون ، جورج لوكاتش، ترجمة عادل العواء، دمشق، ١٩٧٠، ص ١٥.

١٠- هنری ارفون، هەمان سەرچاوە، ل ١٦٠.

١١- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ١٤٨.

١٢- یوسف اباذری ،سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٧.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٨.





١٤- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ١٥٤.

١٥- هەمان سەرچاوە، ل ١٥٤.

١٦- یوسف اباذری ،سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٨.

١٧- جورج لوكاتش، معنى الواقعية المعاصرة، ترجمة دكتور امين الصبوطى، دار المعارف بمصر، سنة ١٩٧١، ص ٥.

١٨- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ص ١٤٩،١٤٨، ١٥٤.

**١٩** - یوسف اباذری ، سەرچاوەی پێشوو، ل **١٦٨.**

٢٠- هنری ارفون، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧.

٢١- جورج طرابيشى، معجم الفلاسفة، دار الطليعة، بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٧٨، ص ٥٥٥، جورج لختهايم، المصدرالسابق، ص ٥١، یوسف اباذری، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٨.

٢٢- یوسف اباذری ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٨.

٢٣- د. تقي ازاد ارمكى ، نظريه هاي جامعه شناسى، ص ١٣٩.

٢٤- د. رمضان محمد غانم، مصدر سابق، ص ١٥٣، جورج طرابيشى، معجم الفلاسفة، مصدر سابق، ٥٥٤،

٢٥- د. رمضان محمد غانم، مصدر سابق، ص ١٤٩.

٢٦- د. رمضان محمد غانم، مصدر سابق، ص ١٥٠-١٥٤.

جۆرج لختهایم لەبارەی ئەو کتێبەی لۆکاشدا دەڵێت: ئەوەی کە لۆکاش لە کتێبی ( تێزەکانی بلۆم) دەیخاتە روو بریتییە لە پیلانێکی رادیکالیانەی-دیموکراتیخواز، کە تەنیا دەیەوێت سیستەمی حوکمرانی بگۆڕێت بۆ سیستەمێکی دیموکراتی کۆماری، کەواتە دەبێت بیرۆکەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا بەپێی ئەو تێگەیشتنەی کە بەلشفییەکان باسیان لێوە دەکرد بە لاوەبندرێت، لەبەر ئەوەی لۆکاش و لاندلر پیلانی ئەوەیان دادەرشت کە هاوپەیمانی لە گەل دیموکراتیخوازە کۆمەلایەتییەکان

سازبکەن، جا لەبەر ئەوە هەرچەندە تێزەکانی بلۆم بە زمانێکی لینیننیزمییانە دارێژراوە، بەلام هەولێك بووە بە مەبەستی دەرچوون بە ستراتیژیەتێك لە پێناو بەرپاکردنی شۆرشێکی دیموکراتیخوازانە. بڕوانە: جورج لختهایم، مصدر سابق، ص ٦٨-٦٩.

٢٧- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ١٥٠. لۆکاش خۆی سالی ١٩٣٣ رەخنەی لەو کتێبەی خۆی گرتووە، خۆی بەوە تاوانبار کردووە کە وەکو پێویست پەیوەندی بە چینی کرێکار نەکردبوو، کە ئەمەش وای لێکردبوو کە لە دیالیکتیکی مەتریالیزمی بەرەو ئایدیالیزمی یاخود میکانیکی بچێت، یاخود دیالیکتیك لە مەتریالیزم جیابکاتەوە. بەلام دواتر لە سالی ١٩٦٧ ئەم رەخنە لە خۆگرتنەی بە پێویستیەکی تەکنیکی دادەنا، تاوەکو لە ململانێکەدا بەردەوامی بە خۆی بدات، هەرچەندە نکۆلیشی لەوە نەکردووەکە کتێبی (مێژوو و هۆشیاری چینایەتی) کۆمەلە هەلە یەکی تێدا بووە. بڕوانە: سامي خرطبيل، الكلية عند لوكاش، مجلة الدراسات العربية، السنة السادسة عشرة، العدد ١٢، تشرين الاول ١٩٨٠، ص ٩٥.

٢٨- جورج لوكاش، التاريخ و الوعى الطبقى،مصدر سابق، ص ١٣-١٤.

٢٩- سامي خرطبيل، مصدر سابق، ص ٩٧، هەروەها بڕوانە: جورج لوكاش، التاريخ و الوعي الطبقى، مصدر سابق، ص ٣٣.

٣٠- جورج لوكاش، التاريخ الوعى الطبقى، مصدر سابق، ص ١٩٥.

٣١- هنرى ارفون، مصدر سابق، ص ١٥.

٣٢- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ١٥٠.

٣٣- جورج لوكاش ، التاريخ الوعى الطبقى، مصدر سابق، ص ٢٩٢.

٣٤- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ١٥٠.



٣٥- جورج لوكاتش ، الرواية كملحمة بورجوازية، ، ترجمة جورج طريشى، بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٧١، ص ٥. ئەم نووسینە (راپۆرتێك دەربارەی رۆمان) لۆكاش لە سالّی ١٩٣٥ دوای پێداچوونەوەی فرەوانتری کرد و بەناونیشانی (رۆمان وەك مەلحەمەیەکی برجوازی)بلاّویکردەوە، کە لە راستیدا ئەمەش ئاماژەکردنێکی راستەوخۆ بوو بە کاریگەری لۆکاش بە هێگڵەوە، چونکە هێگڵ رۆمان واپێناسە دەکات کە مەلحەمەی برجوازییە، هەمان سەرچاوە ل٦.

٣٦- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص ١٥١.

٣٧- هەمان سەرچاوە، ل ١٥٢.

٣٨- جورج لوكاتش، معنى الواقعية المعاصرة، مصدر سابق، ص ٧. مێژووی نووسین و بلاّوکردنەوەی ئەم کتێبە لە سەرچاوەکاندا بە شێوەی جیاواز باسکراوە، بۆ نموونە، د. رمضان محمد غانم سالّی ١٩٥٥ی بە مێژووی بلاّوکردنەوەی ئەم کتێبەدا ناوە،بڕوانە باسەکەی لە گۆڤاری( المنار)، ژمارە ٥٠، سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٢، بەلاّم وەرگێری عەرەبی کتێبەکە سالّی ١٩٥٧ی بە مێژووی بلاّوکردنەوەی داناوە، بڕوانە: جورج لوكاتش ، معنى الواقعية المعاصرة، مصدر سابق، ص ٧.

٣٩- جورج لوكاتش ، معنى الواقعية المعاصرة، مصدر سابق، ص ٧.

٤٠- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش ، مصدر سابق، ص١٥٢.

٤١- جورج لوكاتش ، تحطيم العقل، ترجمة الياس مرقص، دار الحقيقة بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٨٠، الجزء الاول، ص ١٢.

٤٢- د. رمضان محمد غانم، جورج لوكاش، مصدر سابق، ص ١٥٣.

٤٣- عبدالمنعيم سليم، جولة فى العقل الاوروبي، مكتبة مدبولى، القاهيرة، الطبعة الاولى، ١٩٨٦، ص ١١٣.

٤٤- د. تقي ازاد ارمكى ، نظريه هاى جامعه شناسى، ص ١٣٨.





## کۆتایی

لەم باسەدا کە لە سەر هزری هێگڵ و دوو لە قوتابیانییەتی لە سەدەی بیستەم، دوای ئەوەی لە بەشی یەکەمی باسەکەدا بە شێوەیەکی هەمەلایانانە باسمان لە فەلسەفەی هێگڵ کرد، بۆمان دەرکەوت کە هزری ئەو بیرمەندە زۆر فراوانە و سیستەمێکی هاوتەبایی فەلسەفییانە بەڕێوەی دەبات، کە سەرجەم بوارەکانی لۆجیك و هونەر و ئاین و مێژوو یاسا و سیاسەت و هتد.. لەناو ئەو سیستەمە فەلسەفییەدا لە چوارچێوەی تێروانینێکی هاوتەبا و گونجاو دەخولێنەوە.

دیارە ئەوەندەی کرابێت لەم بەشەدا لەسەر هزری هێگڵ، هەوڵمانداوە بە شێوەیەکی گشتگیر و چڕ باس لە هزری ئەو بیرمەندە بکەین، جا زۆر جاران ناچار بوین ڕاگوزەرانە بەسەر هەندێ لایەنی هزری ئەو بیرمەندە تێپەڕین و خۆمان لەو کون و کەلەبەرانە نەدەین، کە لەوانەیە زیاتر لەو باسەدا هەڵبگرێت، بەڵکو پێویستی بە باس و کتابی تایبەتی و سەربەخۆ هەیە، چونکە لە باسێکی وادا مەحاڵە بتوانرێت فەلسەفەی هێگڵ بەتەواوی بخرێتە ڕوو، بەلاّم ئەوەندە کرابێت هێڵە سەرەکەکانی ئەو بیرمەندە باسیان لێوەکراوە.

لە هەردوو بەشی دووەم و سێەمی ئەو کتێبەدا هەوڵمانداوە باس لەو دوو بیرمەندەی سەدەی بیستەم بکەین، کە کاریگەرییەکی فراوانی فەلسەفەی هێگڵیان بەسەرەوە بووە، ئەم دوو بیرمەندەش بریتین لە هێربێرت مارکیوز و جۆرج لۆکاش. هەرچەندە ڕوون و ئاشکراشە کە هەر تەنیا ئەو دوو بیرمەندەی سەدەی بیستەم لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی هێگڵدا نەبوونە، بەڵکو چەندان



فەیلەسوف و بیرمەندی دیکەش، هەر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە لە ژێر کاریگەری هێگڵدا بوونە، کە بە نێوبانگترینیان بریتی بوونە لە فیورباخ و شتراوس و مارکس و برادلی و رویس و ئەسکەندەر هرزن و فکتۆر کوزان.. و چەندان بیرمەندانی دیکە، کە زۆربەیان بە سەر هەدوو قوتابخانەی چەپ و ڕاستی هێگڵیزمدا دابەشبوونە.

جا لەبەرئەوەی فەلسەفەی هێگڵ کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لە سەر بیرمەندانی دوای خۆی، ئەمە وای کرد ئەو فەیلەسوفە لە مێژووی نوێی فەلسەفەدا پانتایەکی فراوان داگیر بکات، بۆیە ئەلکسەندەر کۆجیف دەڵێت: (هەروەك چۆن بە پێی بۆچونی هێگڵ ناپلیۆن کۆتایی بە مێژوو هێنا، بە هەمان شێوەش هێگڵ کۆتایی بە مێژووی فەلسەفە دەهێنێ)(*)، هەرچەندە ئەم قسەیەی کۆجیف لە وانیە زێدەڕۆییەکی تێدا بەدی بکرێت، چونکە گومان لەوەدا نیە کە مێژووی فەلسەفە کۆتایی پێنایەت تاکو مرۆڤایەتی لەسەر گۆی زەمیندا مابێت و بیرکردنەوەی مرۆڤ لە ئارادابێت، بەلاّم دیارە ئەم قسەیەی کۆجیف زیاتر ئاماژەکردنێکە بە گرنگی و مەزنی ڕۆلی فەلسەفەی هێگڵ لە مێژووی نوێی فەلسەفەدا.

جا سەرەرای کاریگەری زۆر لە بیرمەندانی جیهان بە فەلسەفەی هێگڵ، ئێمە ئێستا پێمان وایە کاریگەری ئەم فەلسەفەیە بەسەر دوو بیرمەندی جیهانی لە سەدەی بیستەمدا گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، کە شایەنی ئەوەیە قسە و باسی لەسەر بکرێت، بە تایبەت لەو کاتەی کە باس لەو بیر و بۆچوونە وروژێنەرانەی

* ئەم قسەیەی کۆجیف لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: جورج طرابيشى، معجم الفلاسفة، دار الطليعة، بيروت ١٩٨٧، ص___٦٦٨___ .

هزری سەدەی بیستەم دەکرێت. لە بەرئەوەی ئەم دوو بیرمەندە (مارکیۆز و لۆکاش) لە سەدەی بیستەمدا رۆلێکی بەرچاویان گێڕاوە لەداهێنانی چەمکە فەلسەفییەکاندا، لە پشت بیرکردنەوەی هەر یەك لەم دوو بیرمەندەدا فەلسەفەی هێگڵ بە شێوەیەکی بەرچاو و روون ئامادەیی خۆی دەنوێنێت.

لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا باس لە هزری هێربێرت مارکیۆزدەکەین بۆمان دەردەکەوێت کە بیرۆکەی نیگتیڤیزم (**فكرة او فلسفة النفي**) کە مارکیۆز بە سوود وەرگرتنی لە هزری هێگڵ بە کاریدەهێنێت، ئەم چەمکە فەلسەفیە لە سەدەی بیستەمدا لەسەر دەستی مارکیۆز عەقڵخوازی پێ ئەکتیڤ و نوێ دەبێتەوە، دیارە گومان لەوەدا نییە، کە بیرۆکەی نێگێتیڤزم (**فكرة النفي**) لە بیری هێگڵدا شوێنێکی بەرچاوی هەیە، لای مارکیۆز دوای گەڕانەوەی بۆ هزری هێگڵ دەتوانێت ئەو سیفەتە شورشگێرییەی عەقڵ لەو نێگێتیڤیزمە بدۆزێتەوە و پەرەی پێبدات، کە دەشێت لە عەقڵدا بەدی بکات، بەو پێیەی مارکیۆز بە سوودوەرگرتن لە فەلسەفەی هێگڵ و دواتر گەرانەوەی بۆ سەر هزری مارکس و دواتریش خوێندنەوەی فرۆید، وای لێدەکات کە ببێتە خاوەنی تیۆری شۆڕشی نوێ، کە لای ئەو هەڵگیرسێنەر و پاڵنەری ئەم شۆڕشە نوێیە ئەو کەسانە دەبن، کە لە پەراوێزی کۆمەڵگای تاك رەهەندی سەرمایەداریدا دەژین و فەرامۆشکراون، مارکیۆز هیوای بەو بێ هیوایانەیە، کە لە کۆمەڵگا سەرمایەداریدا دەژین.

لە بەشی سێیەم و کۆتایی ئەم کتێبەماندا باسی هزری جۆرج لۆکاش دەکەین، کە لە میانەی خستنەڕووی مێژووی پەرەسەندنی بیری ئەو هزرمەندە بۆمان دەردەکەوێت کە جۆرج لۆکاش هەمیشە لە هەڵکشان و داکشانێکی هزریدا



بووە، لە ژێر کاریگەری هزری بیرمەندانی وەکو کانت و هێگڵ مارکس و دلتای و کیریگارد و سیمل و ماکس ڤیبەردا بووە، بەلاَم زیاتر ئەو بیرمەندە وەکو بیرمەندێکی باڵی چەپی فەلسەفەی هێگڵیزم دەرکەوتووە، لۆکاش لە مەر تیوری ئەدەب بە پشتبەستن بە بۆچوونەکانی هێگڵ لەمەڕ چەمکەکانی گشتگیر (totality) و نامۆبوون و بە شتبوون (**الاغتراب والتشيء**) هەوڵیداوە ببێتە خاوەنی بۆچوونی تایبەتی خۆی لە بواری ئیستاتیکادا.

بەم شێوەیە کە فەلسەفەی هێگڵ پانتایی یەکی فراوانی داگیرکردووە لە مێژووی فەلسەفەی نوێدا و دەشکرێت بگوترێت لە سەدەی بیستەمدا هێربێرت مارکیۆز و جۆرج لۆکاش وەکو دوو بیرمەندی داهێنەر کە بە پشت بەستن کەلتووری فەلسەفی هێگڵ توانیویانە ببنە خاوەنی تێروانینی تایبەتی خۆیان و فەلسەفەی تایبەت بە خۆیان لە سەدەی بیستەمدا بەرهەمهێناوە.





## ملخص الكتاب

## هيجل واثنان من تلامذته( ماركيوز ولوكاش)

هذا الكتاب عبارة عن دراسة حول فلسفة هيجل واثنان من تلامذته، وهما هيربرت ماركوز ( ١٨٩٧-١٩٧٩ ) و جورج لوكاش ( ١٨٨٥- ١٩٧١)، وينقسم الى ثلاثة الاقسام، حيث يتناول القسم الاول فلسفة هيجل بصورة عامة، وذلك من خلال ثلاثة محاور، ففي المحور الاول تم عرض حياة وفكر هيجل ، و المحور الثاني خصص لموضوع النظام المنسجم لفلسفة هيجل، اما المحور الثالث والاخير فيتناول فلسفة القانون والدولة لديه .

اما القسم الثاني فيتناول فلسفة هيربرت ماركوز ، وذلك من خلال محورين، يقوم المحور الاول بتناول حياة ماركوز وفكره ، ويقوم المحور الثاني بعرض موضوع مفهوم الماهية لديه.

والقسم الثالث والاخير من هذا الكتاب خصص لبحث و دراسة فكر جورج لوكاش، و ذلك من خلال سرد سيرة حياته الفكرية .

عليه تتبين لنا من خلال هذه الدراسة و بشكل جلي اهمية فلسفة هيجل وتأثيرها على الفلسفة الحديثة، و بهذا الشأن قال الكسندر كوجيف: "كما ختم نابليون، بحسب هيجل، التأريخ الانسانى، كذلك يختم هيجل تأريخ الفلسفة." و على الرغم من اننا نملك اليقين التام بأن الفلسفة لصيقة بالانسان، فأنها ستكون



بذلك مستمرة طالما عاش الانسان و فكرَّ، وبالتالى تنتهى الفلسفة بنهاية الانسان على الارض، وبذلك فلا يمكن التكهن بنهاية الفلسفة دون التكهن بنهاية الانسان، اما فحوى العبارة التى اوردناه لكوجيف فانها تعبر عن مدى اهمية فلسفة هيجل فى تأريخ الفلسفة الحديثة.

كذلك ركزنا فى هذه الدراسة على اثنين من المع المفكرين اللذين عاشوا في القرن العشرين وهما ماركيوز و لوكاش، على الرغم من وجود اسماء لامعة اخرى للمفكرين من امثال فيورباغ و شتراوس و ماركس وبرادلي الخ.. الذين عاشوا وفكروا وابدعوا تحت مظلة فلسفة هيجل في القرن التاسع العشر. إلا اننا ركزنا فى هذه الدراسة على اثنين من المع المفكرين في القرن العشرين، وذلك لان ماركيوز ولوكاش تأثرا بشكل واضح بفلسفة هيجل، وابدعا كل واحد منهما بطريقة تفكيره المتميزة من خلال قرأتهما لفلسفته، وفهمهما للكثير من المفاهيم و الاصطلاحات الفلسفية، مما ادى الى انقاذ التفكير الانسانى في القرن المنصرم من الجمود و الشلل .

حيث استطاع هيربرت ماركوز من خلال استعارة مفهوم هيجل لفكرة السلب، إعادة الحيوية للعقل والثورية للعقلانية القرن العشرين، تلك العقلانية التى كانت متورطة في العقائدية الجامدة.

كما استطاع جورج لوكاش من خلال إستيعاب مفهوم هيجل للعلاقة الجدلية بين الذات والموضوع، تقديم كل ما هو ممكن وحيوى فى مجال علم الجمال والنظرية الادبية.

وعلى الرغم من وجود انتقادات شديدة تعرض لها المفكران - ماركيوز و لوكاش- من قبل بعض المنتقدين، وذلك سواء من قبل اعدائهما او الآخرين، إلا





ان ذلك لم يكن له تأثير فى تفكيرهما في عالم الفكر والفلسفة، والاستمرار و الابداع في تقديم كل ما يتعلق بتحرير الانسان، و وضع معالم الضرورية لمنع تدمير إرادة الانسان المتجهة نحو بناء مجتمع افضل.

وهكذا توصلنا في النهاية الى نتيجة مؤداها أن كلا تلميذي هيجل –ماركيوز و لوكاش– تمكنا من اعطاء الحيوية لتراث الهيجلي المتراكم في القرن التاسع العشر، و احياء هذا التراث في القرن العشرين، بحيث اصبحت للفلسفة دوراً فعالاً في الحياة اليومية، و استعادت بالتالي مهمة او محاولة الجواب على التسؤلات التي كانت تُحيّر الانسان وتشغل باله، الانسان الذى يعيش بُعداً واحداً بحسب ماركيوز.





# Abstract


## Hegel and his two students (Marcuse and Lukacs)

This book is a study about the philosophy of Hegel and his two students, whose Herbert Marcuse (1897-1979), and George Lukacs (1885-1971) . The book consists of three chapters, In the first chapter deals with the philosophy of Hegel in general, through three section, in the First section, we talk about Hegel's life and his thought, in the second section, we dealt with the subject of the harmony in the Hegel philosophy, and then we specialized the third section for the topic philosophy of law and the State in Hegel philosophy.

In the second chapter we talked about the philosophy of Herbert Marcuse, through two section, in the First section, we dealt with the life and Marcuse thought, and we specify second section to his theme of the concept of the substance.

The third and final chapter of this book tackles the research and study of the thought of George Lukacs, and so through the narrative of his intellectual biography

This study clearly shows to us the importance of the philosophy of Hegel and the significant impact on modern philosophy, in this regard Alexandr Kojiv said: "As Napoleon ended, according to Hegel, human history, as well as, the Hegel ended philosophy date."

Although we are certainty that the philosophy is related to the human, it continues as long as human thinking and living, that the philosophy ends by the end of human life on the earth.

but that substance of the words of Kojiv refre to the importance of the philosophy of Hegel in the history of modern philosophy.

In spite of the presence of illustrious names of intellectuals who lived under the umbrella of Hegel's philosophy, in the nineteenth century, such as Feuerbach, Strauss, and Marx and Bradley etc. ... but we in this study focused on two of the brightest thinkers in the twentieth century, Marcuse and Lukacs, they affected by Hegel's philosophy, and they invent every one of their way of thinking outstanding, through the return to the philosophy of Hegel, many of the concepts and philosophical terms, which led to the rescue of humanitarian thinking in the past century stalemate.

Herbert Marcuse through borrowing Hegel concept about the idea of negativity, could the revitalization of





the brain and revolutionary of the twentieth century rationality, That rationality, which was involved in ideological stereotypes. George also was able to absorb Lukacs through Hegel concept of the relationship between the self and the contentious subject, providing all which is possible and vital role in the area of aesthetics and literary theory.

Although there is strong criticism against both intellectuals-Marcuse And Lukacs - that, whether by their enemies or the others, but this did not have an impact on the thinking in the world of thought and philosophy, and creativity continue to provide all the liberalization of rights, and develop features necessary to prevent demolition will rights towards building a better society.

So in the end that we conclude that the two students of Hegel both Marcuse And Lukacs, we were able to give vital to the Hegel heritage accumulated in the nineteenth century, and this heritage alive in the twentieth century so that the active role of philosophy in everyday life, and restore functions on the philosophy of the answer questions that bewilders human, which live one dimension according to Marcuse.

## سەرچاوەکان

### ١- باللغة العربية:

**الكتب:**


١. احمد امين و زكي نجيب محمود ، قصة الفلسفة الحديثة، القاهرة، ١٩٦٧.

٢. ارنست كاسير ، الدولة والاسطورة ، ترجمة د. احمد حمدي حمود ، الهيئة المصرية ، ١٩٧٥.

٣. امام الفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، دار المعارف بمصر، بدون سنة نشر.

٤. د.اميرة حلمى مطر، الفلسفة عند اليونان ، كلية الاداب، جامعة القاهرة، دار النهضة العربية، القاهرة ١٩٧٤ .

٥. السدير ماكنتير ، ماركيؤز، ترجمة عدنان كيالى، بيروت ١٩٧٢.

٦. پول روبسون ، اليسار الفرويدي، ترجمة لطفى فطيم و شوقى جلال، مراجعة و تقديم د. قدري حفني، بيروت ١٩٧٤.

٧. جان هيپوليت، دراسات في ماركس و هيجل، ترجمة جورج صدقني، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٧١.

٨. جان تووشار ، تأريخ الفكر السياسي ، ترجمة د. علي مقلد ، بيروت، الطبعة الثانية ١٩٨٣.

٩. جورج طرابيشى، الإستراتجية الطبقة الثورية، بيروت، الطبعة الثانية ١٩٧٩.

١٠. جورج طرابيشي، معجم الفلاسفة، دار الطليعة، بيروت، ١٩٨٧.





١١. جورج لوكاتش ، التأريخ و الوعي الطبقي، ترجمة د. حنا الشاعر، دار الاندلس، طبعة الاولي، ١٩٧٩.

١٢. جورج لوكاتش، الرواية كملحمة برجوازية، ترجمة جورج طرابيشي، بيروت، ط ١، ١٩٧١.

١٣. جورج لوكاتش، تحطيم العقل، الجزء الأول، ترجمة الياس مرقص، دار الحقيقة بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٨٠.

١٤. جورج لوكاتش، معنى الواقعية المعاصرة، ترجمة دكتور أمين العيوطى، دار المعارف بمصر، ١٩٧١.

١٥. جورج لختهايم ، لؤكاش ، سلسلة اعلام الفكر العالمي- المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت ١٩٧٥.

١٦. د.زكريا ابراهيم ، هيجل او المثالية المطلقة، عبقريان فلسفية، القاهرة، بدون سنة نشر.

١٧. شارل مالك، المقدمة، الاثار العربية الكاملة، القسم الاول، المجلد الاول، بيروت،١٩٧٧.

١٨. د.شيرزاد احمد نجار ، دراسات في علم السياسية ، اربيل ، ٢٠٠٤.

١٩. د.عبد الرحمن بدوي ، حياة هيجل، بيروت، الطبعة الاولى ١٩٨٠.

٢٠. عبدالمنعم سليم، جولة فى العقل الاوروبي، مكتبة مدبولى، القاهيرة، الطبعة الاولى، ١٩٨٦.

٢١. علاء طاهر، مدرسة فرانكفورت من هوركهايمر الي هابرماز، منشورات مركز الانماء، القومى، بيروت بدون سنة نشر.






٢٢. د.فؤاد زكريا ، هربرت ماركيوز، دار فكر المعاصر للنشر و التوزيع، القاهرة ، اغسطس ١٩٧٨.
٢٣. فاسيلى بودو ستنيك ، اوفشى ياخوت، الف باء المادية الجدليـة، ترجمـة جـورج طرابيشى، دار الطليعة بيروت، الطبعة الاولى ١٩٧٩.
٢٤. فريدريك انجلس، التفسير الاشتراكي للتأريخ، دار الفارابي، بدون سنة نشر.
٢٥. السدير ماكنتير، ماركيوز، ترجمة، عدنان كيالى بـيروت، الطبعـة الثانيـة، اب ١٩٧٢.
٢٦. د.قيس هادي احمد، الانسان المعاصر عند هربرت ماركيوز، بيروت ١٩٨٠.
٢٧. مارجوى جرين، هايدجر، ترجمة مجاهد عبدالمنعم مجاهد، بيروت ١٩٧٣.
٢٨. محمود أمين العالم، ماركيوز أو فلسفة الطريق المسدود، بيروت ١٩٧٢.
٢٩. ميشل متياس ، هيجل و الديمقراطية ، ترجمة د.امام عبدالفتاح امام ، بيروت ، الطبعة الاولى، ١٩٩٠.
٣٠. هربرت ماركوز، الإنسان ذو البعد الواحد، ترجمة جورج طرابيشى، بيروت، الطبعة الثالتة، ١٩٧٢.
٣١. هربرت ماركوز، فلسفة النفي، دراسات في النظرية النقدية، ترجمة مجاهد عبدالمنعم مجاهد، منشورات دار الاداب، بيروت ، الطبعة الاولى، مايو ١٩٧١.
٣٢. هربرت ماركيوز، العقل و الثورة ، هيجل و نشأة النظريـة الاجتماعيـة، ترجمـة د. فؤاد زكريا، بيروت الطبعة الثانية ١٩٧٩.
٣٣. هربرت ماركيوز، الماركسية السوفياتية، ترجمة جـورج طرابيـشى، طبعـة ثانيـة منقحة، بيروت ١٩٧٣.
٣٤. هربرت ماركيوز، نظرية الوجود عند هيجل، ترجمة إبراهيم فتحي، دار التنـوير ، بيروت ط ١، ١٩٨٤ .
٣٥. هنرى ارفون ، جورج لوكاتش، ترجمة عادل العواء، دمشق، ١٩٧٠.



٣٦. هربرت ماركيوز، الثورة و الثورة المضادة، ترجمة جـورج طرابيـشي، دار الآداب، بيروت ١٩٧٣.
٣٧. هربرت ماركيوز، الحب و الحضارة، ترجمة مطاع صفدي، بيروت ١٩٧٠.
٣٨. هيجل ، أصول فلسفة الحق ، المجلد الاول ، ترجمة وتقديم وتعليق د. امـام عبـد الفتاح امام ، دار التنوير ، بيروت الطبعة الثانية ، ١٩٨٣.
٣٩. هيجل، العقل في التاريخ، محاضرات في فلـسفة التـاريخ، الجـزء الأول، ترجمـة و تقديم و تعليق د.امام عبدالفتاح امام، المكتبة الهيجلية، دار التنـوير، بـيروت، بدون سنة نشر.
٤٠. هيجل، مبادئ فلسفة الحق، ترجمة تيسير شيخ العرب، دمشق، ١٩٧٤.
٤١. هيجل، موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، ترجمة د. امام عبدالفتاح امام، المكتبة الهيجلية ٦، بيروت، ١٩٨٣.
٤٢. ولتر ستيس، المنطق و فلسفة الطبيعـة (فلـسفة هيجـل)، المجلـد الاول، ترجمـة د. امام عبد الفتاح امام، بيروت، الطبعة الثالثة، ١٩٨٣.
٤٣. ولتر ستيس، فلسفة هيجل، المجلد الثانى، فلسفة الروح، ترجمة د. امام عبدالفتاح امام، دار التنوير للطباعة والنشر، بيروت، الطبعة الثالثة، ١٩٨٣.
٤٤. ويل ديورانت، قصة الفلسفة، ترجمة فتح الله محمد المشعشع، بيروت، بـدون سـنة نشر.





**المجلات:**

١. د.رمضان محمد غانم، جورج لوكاش، مسيرة فكر وحياة، منشور في مجلة المنار، شهرية سياسية فكرية عدد ٥٠، فبراير/ شباط ١٩٨٩، ص ص (١٤٦-١٥٤).
٢. سامي خرطبيل، الكلية عند لوكاش، مجلة الدراسات العربية، السنة السادسة عشرة، العدد ١٢، تشرين الاول ١٩٨٠، ص ص ( ٩٥- ١١٤).
٣. لوسيان غولدمان، تأملات في فكر هربرت ماركوز، ترجمة جورج طرابيشي، منشور فى مجلة دراسات عربية، مجلة فكرية اقتصادية اجتماعية، العددان ٨-٩، السنة الثالثة عشر، حزيران، تموز ١٩٧٧، ص ص ( ١٤١-١٥٩).
٤. مصطفى مرجان، د.محمد محلوف، حركة مايو في فرنسا، منشور في مجلة المنار، شهرية سياسية فكرية عدد ٤١ مايو-ايار ١٩٨٨، ص ص (١٢٦- ١٣٩).
٥. مطاع صفدي ، اللاشعور بين السلوك والإجراء، منشور فى مجلة الفكر العربي المعاصر، مجلة العلوم الانسانية و الحضارية، العدد ٢٣، كانون الاول ١٩٨٢، كانونى الثاني ١٩٨٣، (٤-١٥).





**٢- زبان فارسى:**

**- كتاب:**

١. تقي ازاد ارمكى، **نظريه هاى جامعة شناسى**، انتشارات سروش، چاپ اول ١٣٧٦.
٢. جان پلامناتر، شرح ونقدى بر فلسفهى اجتماعى وسياسى هگل، ترجمهء د.حسين بشيريه، تهران چاپ دوم، ١٣٧١.
٣. كارل.ر. پوپر، جامعه باز و دشمنانش، ترجمهءعلى اصغر مهاجر، تهران، تابستان، چاپ سوم ١٣٦٩.
٤. و.ت . ستيس، فلسفه هيجل، مجلدى دووهم، ترجمه د. حميد عنايت، تهران.
٥. ه.استيوارت هيوز، هجرت انديشه اجتماعى (١٩٣٠-١٩٦٥)، ترجمهءعزت الله فولاوند، انتشارات طرح نو، تهران ،چاپ اول ١٣٧٦.
٦. يوسف اباذرى، خرد جامعه شناسى ، طرح نو، چاپ اول، تهران، ١٣٧٧.

**- ماهنامه:**

- دكتر حسين بشيريه، تاريخ انديشههاو جنبش هاى سياسى در قرن بيستم، بخش هفتم، ماركسيسم انتقادى: ماركوزهو هابرماس، اطلاعاتى سياسى- اقتصادى، شماره ٧١-٧٢ سال هفتم/ مرداد وشهريور/١٣٧٢.

## ٣- بە زمانی کوردی:

### کتێب:

١. د.مەحەمەد کەمال، فەلسەفەی هێگڵ، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.
٢. عوسمان یاسین، بونیادگەری پێکهاتووی، میتۆدی لوسیان گۆلدمان، چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین، هەولێر ١٩٩٩.
٣. عوسمان یاسین، فریدریك نیتشه، دەزگای چاپ وبلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ٢٠٠٠.

### گۆڤار:

- مەحەمەد کەمال، دیالیکتیکی زات وبابەت، لێکۆڵینەوەیەکە لە بەر رۆشنایی فەلسەفەکەی هێگڵ، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە ٧، بەهاری ١٩٨٩.




## فەرهەنگی ناوەکان

### ئەلف







